# داشا مەجید

## سڵاو لە ساباڵاغ



نووسەر:
ئەحەد ئەنجیری موتلەق

# پێشکەش

پـــێشکەش بـــە دایکـــی خـــودا لێخـــۆش بـــووم خـــات فـــاتمێ مـــەدرەسەی، دایکـــی تـــەوای قـــوتابیانی سابڵاغی بەرێز، کە هـەمیشە سـایەی چـەتری فـیداکـاری وی لەسەرخۆم ئیحساس دەکەم و خۆشی ژیانم لە وی را دەزانم.

بیستم اسفندماه هفتاد و یک

# مقدمه

سالها بود در اندیشه بودم که قدمی فرا روی شهر عزیز خود بردارم و هر آنچه در مدت عمر در آن به عینیت دیده‌ام برصفحه کاغذ نگارم تا بعداز اینکه از دارفانی رخت بربستم آثاری از خود برجای گذاشته و برای آخرتم توشه‌ای همراه باشد.
حدود سال ۵۲ تصمیم به اجرا در آمد و قدم در میدان عمل گذاشته شد، به سبک ترجیع‌بند شیخ‌اجل سعدی که خود را غلام حلقه بگوش او میدانم آنچه مورد نظر بود به زبان کردی بر روی دفتر نگاشتم که چند سطر از ابتدای مقدمه آن بشرح زیر است:

ئەی شەمعی ژیانی جەمعی خەڵکان　　ئەی پشت و پەناهی دڵشکەستان
ڕووناکی دوو چاوی خوێن دەبارم　　قیبلەی شەرف و هومیدی بابان
کۆرپەی دەعەزیز و دڵرفێنم　　لالەی چەمەن و گوڵی گوڵستان
موودێکە خەبەر نی‌یە لەلای تۆ　　نازانی کە چۆنە زیندەگیمان
تۆ دووری لە من کە بۆت بەیانکەم　　ئەحوال و ژیانی خەڵکی خۆمان
چوون ئەو سەفەرە هەناوی پرئێش　　چا نابێ بە دوکتور و بە دەرمان
وا چاکە بە نامە بۆت بنووسم　　ئەو شارە چ بوو، چلۆنە ئەلعان

... و در حالیکه هنوز تأهّل اختیار نکرده و مجرّد بودم خود و همسرم را در عالم خیال علیل و زمین‌گیر تصور نموده، طی نامه‌ای که شامل محتویات همین کتاب بود برای فرزند متاهّل و مستقل خود، تاریخ شهر عزیزم را بیان نمودم ولی با تأسف در اثر گرفتاریهای اوایل انقلاب و درگیریهای شهری قسمتی از نوشته‌هایم مفقود گردید و هرچه دنبال آن گشتم آنها را نیافتم تا اقلاً از ثمره زحمات خود بهره‌ای گیرم. ولی باتوجه به آتش شوق و رؤیایی که مدام در درونم زبانه می‌کشید، پیوسته در تکاپو بودم که بین یادداشتهای پراکنده‌ام آنها را بیابم که با تأسف توفیق حاصل نشد تا اینکه شبی راجع به کتاب حیدربابای استاد عالیقدر شهریار بحثی بمیان آمد و نور امیدی در دلم دمیده شد و تصمیم گرفتم از نوشته‌های قبلی صرفنظر کرده به سبک «حیدربابا سلام» به نوشتن کتابم اقدام نمایم.

ماه مبارک رمضان سال ۷۱ چند روزی بود که شروع شده بود که توسن خیال در میدان وصال به جولان درآمد و معمار تفکر سنگ بنای جدید را بنیاد کرد. پس هر آنچه در زوایای خاطرات گذشته‌ام نسبت به وضع شهر عزیز داشتم به سبک «حیدربابا سلام» بر صفحه کاغذ آوردم.

القصه هنوز چندی از ماه مبارک باقی بود که توفیق موافق افتاد و آغاز به پایان منتهی گشت. ولی بعدها بعلت تأخیر در چاپ به تکمیل آن اقدام گردید. البته در نوشتهٔ خود هرآنچه به رأی‌العین دیده و همزمان بوده بدون هیچ تعصب و تملق بیان داشته و اندرین میان اگر بعلت رعایت اوزان شعری از عده‌ای بدون القاب آقا، جناب و... و... نام برده و با همان لقب قدیمی که در شهر بدان مشهور بوده‌اند نام برده‌ام، معذرت می‌خواهم چون اگر غیراز این بود اولاً ناشناخته مانده و در ثانی موجب تجدید خاطرات ساکنان قدیمی شهر نمیشد.

من این کتاب را برای آیندگان عزیز و کسانی که بعداز آنها خواهند آمد نوشته‌ام، تا برای آنان چگونگی وضع شهر که اکنون بکلی دگرگون شده است معلوم شده و برای کسانی که همزمان و یا قبل از من در شهر ساکن بوده‌اند تجدید خاطره باشد و با هر موضوعی که بیان داشته‌ام

یک مقدمه سمبلیک یا به‌قولی یک چاشنی کاملاً بی‌مزه و گاهاً بامزه که هیچ ارتباطی به موضوع مورد بحث ندارد همراه آورده‌ام که اغلب از بی‌وفایی و بی‌بقایی دنیا و یا صفای طبیعت و یا یک موضوع اخلاقی بحث می‌کند، البته صحبت از این موضوعات بدان معنا نیست که انسان دنیا را کنار بگذارد بلکه بدین منظور است که فریب چهره رنگارنگ او را نخورده و انسانیت را فدای مقاصد شوم دنیوی نکند.

والا امر خدائی است که باید کوشش کرد و بر ناملایمات فائق شد که لیس للانسان الّا ماسعی

و اما نوشته‌ام هرچند بصورت نثر نیست ولی هرگز جرأت نمی‌کنم نام شعر را بدان اطلاق کنم چون با گرفتاریها و مشکلاتی که ذکر اسامی مختلف پیش می‌آورد رعایت وزن و قافیه از قدرت من بیرون و خود را در زمره شعرا قراردادن هم مشکل‌تر از آن ، پس اگر اشتباهی مشاهده میشود، دیدهٔ اغماض چاره‌ساز گرفتاری است.

البته در میان اصناف و طبقات مختلف از هر صنفی چند نفری را نام برده‌ام که امکان نام‌بردن همگی ممکن نبود. در هرصورت امید است مورد پسند عزیزان قرار گیرد.

# وجه تسمیه کتاب

نوشته ناقابل خود را بنام «داشامه‌جید» که کوهی زیبا در مشرق شهر مهاباد و مخزن خاطرات مردم و جولانگاه دوران کودکی است نامگذاری کرده و او را از جنبه آگاهی به تاریخ شهر به استادی انتخاب نموده‌ام. ابتدا سعی بر آن بود که تاریخ شهر را در دو قسمت بیان نمایم، یکی تاریخ وضع اجتماعی و سیاسی و دیگری تاریخ تغییرات و چگونگی طبیعت آن، چون رودها، باغها، چشمه‌ها، آداب و رسومها و... و... ولی بعلت اینکه ضخامت کتاب از حوصله خوانندگان عزیزم می‌کاست فعلاً به چاپ قسمت دوم آن اقدام شد. امید است با تمام نواقصی که از هر لحاظ در آن مشاهده می‌شود مورد قبول طبع مشکل پسند عزیزان قرار گرفته و از راهنمائیهای لازم بی‌نصیبم نفرمایند که فکر کوتاه من تا همینجا همراه بود و بالاتر ناتوان.

لازم به تذکّر است که حتماً به همراه خواندن متن کتاب نگاهی به توضیحات مربوطه در آخر آن انداخته شود که هدف صاحب کتاب از توصیف شهر بیشتر درک گردیده و در ضمن برای کسانی که قادر به خواندن کتابت و الفبای کردی نیستند متن کتاب بیشتر مفهوم گردد که توضیحات مکمّل متن است.

## ﴿ بە نێوی خودا ﴾

ئەووەڵی کاریٚ بێ بە نێوی خودا  قودرەتی زاتی وی ببێتن چرا

شۆقی بکا، نێوی دڵ و گیانە روون  تاکوو نەکاتن قەڵەمم رێیە وون

دووەمی قاسیدی رەسوڵی ئەمین  شاهی فەلەک، شۆقی هەتاوی مەتین

سێیەمی، ئەسحابی بووبەکر و عومەر  عوسمانی دوونووره[1]، عەلی تاجی‌سەر

ئیدی بەهەر پاکی لە دونیایە بۆ  خزمەتی ئینسانی بەزاتێوە بۆ

ساڵ و ئەیامانە دەئەو فیکرە دام  تاریخی ئەو شارە بڵێم بۆ برام

تاکوو دەمانگی ڕەمەزانی بەرێز  لوتفی خوداکاری هەموو کردە رێز

نەقشی قەڵەم بەردی بناغەی نواند  ئاوری دەروون بەفری غەمانی توواند

ئێستێ لە ئەو مانگە نەچووبوومە لا  کارانی ئەو خانوو چکۆلەی کرا

ئەمما ئەوێ وەختێ دەبێتن تەواو  خەڵکی قەبووڵی بێ بەنێو قەترە ئاو

قەترەیەکی ئاوی چکۆلە لەگۆم  ماسێکی زۆر وورد بێ لەچۆمانی خۆم

چونکی قەڵەم کوڵە زبانیشە لاڵ  ئەهلی قەڵەم ناکا قسانم بەتاڵ

گەر قەڵەمی عەفوی لەسەردا نەبێ  مێرووله بەدڵۆپەیی ئاو قوم دەبێ[2]

وەختێکی ترسم لە ئیرادێ نەما  شەرحی دەدەم هەرچی کەبێ ماجەرا

جا،ئەوی‌دیتومە مووەدەی عومری‌خۆ  دێنمە سەری کاغەزی هەرچۆنی بۆ

تاکوو ئەگەر نەفتی خەلاس بوو چرام  شۆقی فتیلێک بێ، عەزیزانی دوام

کێن گۆ ئەگەر هیچە، عەزیزە لەلام  خۆشە نەکەن لۆمە، کەچا نێ قەلاّم

گەرچی قەلاّی دمدم و سەد نێ‌بەچاو  ئەمما عەزیزتر بوو لەلام شارە ناو

# داشامەجید[٣]

## «سڵاو»

داشا مەجید سەرتۆ سڵاوی بەتین
چەندە سوئالێکم لەتۆیە لەژبن

بەرزە سڵاو، بێ لە جەوانی ئەتۆ
ئەورۆ بەیەک، ئاوی‌مە ناچێ بەجۆ

چونکی سەفاوخۆشی منالیم خەلاس
ئێستێ ئەتۆ پیری، ئەمن بێ‌حەواس

خۆش‌بوو خلیسکێنی رەفیقانی جوان
بەرقەدی تۆ، سەر تەنەکە و مەنجەڵان

بۆنی گەزیزانی بەهارت لەباد
ئەورۆ گەزیزانی ئەتۆ بێ‌موراد

غەم نەبوو، ئاواتی منالی هەزار
دامێنی تۆ پڕبوو لە منداڵی شار

دیار نێ لەدامێنی تۆ قەبرانی شار
خانوو کرا، قەبرە نەما بەرقەرار

داشا مەجید سینگی ئەتۆ هەڵدڕا
رێ و خەیابانی لەنێوی درا

وابوو خەیاڵ بتکەنە گوڵزاری جوان
ئەمما دڕوو، شین‌بوو بەجەبری زەمان

کێیە دڕووی جێی گوڵی جوانت بوێ
یا وەکوو گوڵ خۆشی بوێ مشتەرێ

باشەجەفا و جەوری زەمانە لەبەر
تەعنە نەدەم چاکە، کە چت‌هاتە سەر

ئەمنیش هەزاران غەم و دەردم هەیە
بۆیە لەتۆ چەندە سوئالم هەیە

عەینی قەدیم، چاکە بەرێز و بەجێ
جوابی سوئالانم بڵێی جێ‌بەجێ

بیرەوەری تۆیە لەنێوی دەروون
بۆتەوە عەمبارە لە دونیای دوون

تۆ خەبەرت زۆرە لە نێو شارەکە
بیری دەروونی تۆ لەمێژوو تەکە

بۆیە تکایەت لێ‌دەکەم هەروەها
دۆستی قەدیم شەرحی بدەی ماجەرا

چونکی خەڵک رەنگی عەوەز کردووە
بیرەوەری نێودڵی وان مردووە

تا نەمەنم دوو لە دەپێنج[٤] رابرا
شەرحی بدەم حاڵی گەلانی برا

ئەمما ئەمن عەینی تۆ مێژووی سەروو
تافەتی زەوتم نەبوو تێکرا هەموو

یـــــادی رەفـــــیقانی عـــەزیز و بـــەڕێز
خـــۆشە بـــەیادی هـــەموو پـــاکـــان کـــەوین
دەرکـــــــەیی ئـــیخلاسێ بکـــەین ئـــاوەڵە
کـــــۆمەڵەیەک شـــوێنی ســـەفا داگـــرین
داشـــــامەجید هـــەمدەم و ئـــوستادی مـــن
مـــــێژووی مـــەهابادێ دەکـــــەم ئـــاوەڵە
چـــون ئـــەتۆ ئـــوستادی ئـــیجازەم بدەی
مـــێژووی مـــەهابادێ(٥) بـــە دووبـــەش دەکـــەم
یـــەک بـــەشی ئـــەحواڵـــی گـــەلانی بـــێ
تـــاکـــوو ئـــەوانـــەی کـــە لەوەیـــاوە دێـــن
حـــاڵی بـــبن شـــارەکـــەمان چـــۆن بـــووە
یـــەک بـــەشی ئـــەوزاعـــی هـــەموو شـــارەکـــە
شـــــەرحـــیدەدەم وەزعـــــیمەهابادیجوان
وەخت و زەمـــــانێکیدێ نـــــابێ ئـــەسەر
شـــــەڕ دەمـــــوقابیلی کـــەسی وا قـــەوی
چـــون دەمـــرم چـــاکـــە لەئـــەو بـــاغی دڵ
دار و درەخت بـــــێتە وەســـیلەی ســـەواب

مـــاو و نـــەماون کـــە لە دونـــیای دێـــز
نـــەک دەرێگـــای پـــیسی خـــەراپـــان کـــەوین
دەســـــتی بـــدەین یـــەک و بـــبین کـــۆمەڵە
ڕێـــی خـــودا و دیـــن و بـــەهەشتی بـــەرین
ئـــەی بـــەتۆ مـــەشغوول بـــووە ئـــاواتـــی مـــن
پـــڕ لە غـــەمە، شـــادی بـــڕێک چـــەلچەلە
وەخـــــتی نـــەزانـــینێ ئـــیشارەم بـــدەی
عـــومرە وەفـــاکـــانـــن، قـــسەی لێدەکـــەم
یـــەک بـــەشی ئـــەوزاعـــی چـــەلانی بـــێ
وەزعـــــی مـــــەهابادێ بـــــە مـــاڵیان بـــڵێن
چـــۆنە بـــەسەرهاتی، مـــێژووی چـــیبووە
بـــاغ و زەوی و چـــۆمی دەگـــەڵ شـــاخەکـــە
گـــوێ بـــێ لەمـــن جـــەمعی عـــەزیزانـــی جـــوان
عـــومرە وەفـــایێنی دەگـــەڵم هـــاتە شـــەڕ
زۆرە مـــــلی نـــــابێ شکـــــاوم لەوی
دارو درەخـــــتێکی بـــــچێنم لەگـــــەڵ
بـــیری بـــەخێر، ســـووکی بکـــاتن عـــەزاب



# «گۆمەکانی سابلاغ[۶]»

داشا مەجید وەختی بەیانانی زوو    خۆش بوو تەماشای وولاتی هەموو
سوزەیی بای داری دەهێنا سەما    غەرقی تەماشایە خەڵک، بۆ سەفا
چۆمە بە نەعرە بە ریشەی کۆلکەدار    چەرخی دەدا هەڵقەنێ بێباتە خوار
دەنگی شەپۆلانی بەهاران لە چۆم    شڵپەیی بەستێنو و سەرو ڕەنگی گۆم
دارو درەختێکی هەڵیقەند بوو    عەینی وەکوو کەشتی بەچۆم دادەچوو
گا، دەچوو بن ئاوێ قەفی کۆلکەدار    گا، لەسەری ئاوێ بەلەنجە و بەلار
خەڵکی تەماشاچی لەمەوجانی چۆم    غەرقی سەفای ئاو و شەپۆلانی گۆم
چۆمە وەکوو جادە بڵیند و نەوی    دەوری لە کەندالی دەکردن نەوی
ئێستێ نە شەپۆلە، نە غەوغا، نە گۆم    خەڵکە وەئێش کەوتۆ، بە دەردانی تۆم
لازمە بیلێم بۆ عەزیز لاوەکان    باسی بەسەرهاتی هەموو گۆمەکان
گۆمەکەی کەندالی[۷] نەماوە لەبن    گۆمی تەنەکە[۸]ش کە لەسەر وی دەبن
گۆمی سەللاخخانە[۹] فەقەت نێوی بوو    جێی کەڵەوان و کەڵ و گامێشێ بوو
هاتینە سەرتر گۆمی دی جوولەکان[۱۰]    نێوی نەماوە بە گۆڕانی زەمان
سەرتری وی گۆمەکە زۆر قووڵ بوو    چونکی لەپێش گۆمەکە بەندێ[۱۱] هەبوو
گۆمێکی زۆر قووڵ و وەلی پیس بوو    چونکی لەنێزیکی دەباغخانە بوو
گۆمی دەباغخانە[۱۲] کە بوو نێوی وی    دەوری دوو سێ کانی وەلی زۆر نەوی
بێنە سەرێ گۆمی دیکە قاوەخان[۱۳]    خەڵکی دەخنکاندن ئەوێ بێ ووچان
باقۆیی زۆر گەورەی دەنێودا هەبوو    چەندە قولاپیان لەمە هەڵ گرتبوو
ڕۆژێ هەتا وەختی شەوێ پڕ سناڵ    هەر مەلە بوو تاکوو درەنگ وەختیساڵ
ئەو گۆمە نێوێکی دیکەی کەوتە سەر    گۆمی عەرووسان بوو کە لاچوو لەسەر

وەختێکی پەردە لەسەری چۆم درا
زاڵمە زۆر خەڵکی دەخنکاندەوە
گۆمەکەی حەمبالان[١٥] لەوی سەرترە
گۆمەکەی حەمبالان دوو نێوی هەبوو
یادێ لەبەستێنی چۆمی و پردەباز
گۆمەکەی سەرنزکە مودام پڕ دەبوو
شۆرەتی ئەو گۆمە، گۆمی تاقەدار[١٧]
گۆمی پلیکانان[١٨] و میرزا کەریم[١٩]
سەرتری وان گۆمی بەنێو بانگ و خۆش
حیلەحیلی شەپۆلی مانگی بەهار
ئەو هەموو ساڵێ دەبوو قەتلێ بکا
نێوەکەی ئەو گۆمە، گۆمی قازی[٢١] بوو
گۆمی میرزا رەحمەتی[٢٢] سەرتر لەوی
گۆمی میرزا رەحمەتی ساڵانی دوا
گۆمی میکایلی[٢٣] کەلەکن باغی بوو
گۆمی دیکە هاتینەوە پردی سوور[٢٤]
پردی سوورم سێ کڵی گەورەی هەبوو
عومری بەئەندازەی مزگەوتی سوور
ئێستێ نەماوە، ئەسەری هەڵگرا
ژینی ئەمەش هەڵ دەگرێ رۆژگار
سەحی گۆمانم بە تەواوی کرا
بەو پیرە ئەحواڵە ئەوەندەم لەبیر
بۆچی ئەسیرە بەوی فیکر و خەیاڵ
گۆمی ژیانیشم ئەمە قوم دەکا
چاکە دەمێنێ کە نەبوو کاری من!

گۆمەکی پردی[١٤] لەبنی سازکرا
روحمی بەهیچ کەس نەدەکردن ئەوە
بەستێنی[١٦] چۆمی لەئەویش ژوورترە
نێوی دیکەی گۆمی منالان لەدوو
نێی دەکەوت کیژ و کوڕی زۆر بەناز
بۆ مەلە مندالی بەگەل لێ دەبوو
ئاوی دەبرد خەڵکی لەوی را بەشار
ئاوێکی مەند بوون و لەجێی خۆ موقیم
لێی دەکرا رۆژی مەلە و عەیش و نۆش[٢٠]
خەڵکانی لەشاری لەتەماشای هەزار
یەک دوو نەفەر غەرقی دەخۆ دابکا
زۆر مەلەوان بۆ مەلە لێی رازی بوو
ماوە هەرئێستاکە، وەلی سەر نەوی
گۆمەکەی مورتووزی لەسەردانەدرا
جومعە و چوارشەمە، مەلەی زۆر دەبوو
قەتلێ هەبوو، غەرقیدەکرد جوور بە جوور
ئەوسەر و ئەوسەر ئی چکۆلەی لەدوو
کاری بەنابەک بوون لەدەورانی دوور
حەیفە کەئاساری لەشاری نەما
نامێنێ دونیایە لەسەر یەک قەرار
تاکوو بیر و باوەری دۆستان چبا
فیکر و خەیاڵم بەغەمی وان ئەسیر
چونکی نەما، گۆم بوو قەباڵەی بەتاڵ
خۆشی بە ئەو دەردە دەچێ بۆ فەنا
لوتفی خودا و مەرحەمەتو و بۆ ئەمن

عــومره بــه پــەنجاو دوو ســاڵی گــەیی
خــــۆشه وەکــــوو گــــۆمه بــمێنێ لەدوا
ئــەو دەمــییه لەززەتـــی عــومری تــەواو
ســەر بــلیند وەک پــیرەهەڵۆ[٢٥] بــۆ نــەبین
زیــندەگــی گــەر دەردە، هــەموو ڕۆژه بــۆ!
هــیچه بــەقودرەت بــی، مــەبه ســەرنەوی
جــەمعی پــەژاریــی ژیــان لادەچــێ
پــووشی ســەری چــۆمه لەســەر ئــاوه هــەر
ئــاوی شــلوی وا، دەبــێ هــەر ڕوون بــێ
مــاسی لەبــن گــۆمی هــەزار ئــاوی وا
ئــارەزوو هــەر دوور و درێــژ و قــەوی؟!
چــاکــه بــڵێن خــەڵکی، کــەژینه نــەما
بــا خــوا نــەبین قــەد لەبــەشێ قــووت بــڕاو
ڕووڕەشــی بــۆ کــاکــەقەله بــێت و ژیــن
گــیانی دەســووتێنێ بــه ئــاورانی خــۆ
وەخــتێکی هــیممەت بــوو، ئــیرادەش قــەوی
پــووشی ســەری چــۆمه، بــەهار وا دەبــێ
شــەپۆله دەیــبانه، قــەراغــانی ســەر
ســەبری دەوێ کــاری ئــەوا بــێته جــێ
دیــتوویه ڕوون بــوّتن بــه کــەیفی دڵا

X



کلەکانی پردی سوور، کە قوولترین گومی سابلاغی بوو.

## ﴾ سەیرانگاکانی سابلاغ [٢٦]«١» ﴿

## ﴾ باغی سیسە [٢٧] ﴿

داشا مەجید دۆستی عەزیز و بەرێز    بێنەوە سەر بەحسی وولاتی عەزیز
عومری بەشەر چیێ؟ دوو سێ ڕۆژە و تەواو    دەوڵەت و ماڵیش وەکوو گۆمان بڵاو
کوا ئەسەرێک لەو هەموو گۆمانە ما؟    دەرسێکی زۆر گەورەیە ماڵیش ئەوا
ماڵێکی خەرجی نەکرێ ڕێی خودا    تۆق و کەلەبچێکە لەمل داندرا
حاسڵی ئەو ماڵە هەزار گەورەیی    بێ‌خەبەری و دڵڕەقی و غەررەیی
ئەمما هەموو پووڵی دوو میتر زەمین    گایە ئەوەش نابێ نەسیبت لە ژین
بەحسێ لە سەیرانگەیی سابلاغ بکەم    یادێ لەئەو شاری عەزیزان بکەم
شەرحی بدەم چۆنی بوو شارم ژیان    چونکی هەموو وەزعی گۆڕاوە ئەلان
باغێکی زۆر جوان کە نێوی سیسە بوو    کانییەکی ڕوونی دەنێودا هەبوو
باغێکی جێی مەست و شەرابخۆرە بۆ    سەید عەلی‌ئەسغەر[٢٨] لەوێ قامی کوتۆ
گەرچی کە نەم دیوە ئەمن سەید عەلی    پیاوێکی دەنگ خۆش و بە باڵا نەوی
وای دەکوت دایکم کە دەگەڵ بابی من    ماڵە مە سەرسفرە لەمەستێ دەبن
لەوسەری سفرە هەموو دەنگ خۆشەکان    مامڵێ[٢٩] و عابید[٣٠] و کابانی[٣١] جوان
سەید عەلی گرۆێ و ڕەش و ئابلەروو    دەنگی وەکوو زەنگوڵە بانگی هەبوو
یادێ لەئەو، لەو هەموو دەنگ خۆشی شار    ڕەحمەتی مەولا لەسەریان بێ قەرار
قامی ئەوی، دەنگی کەریم و قەمەر[٣٢]    لاوکەیی کاوەیسی[٣٣] نەماوە ئەسەر
سەفحەی ئەوانە و گرەمافوونە خۆش    دەرمانی هەر دەردی پەژار و نەخۆش

✕

## کانی مامقەمبەران[٣٤]

داشا مەجید وەختێ کە ڕۆژ دێتە دەر    چاوی لەلای تۆیە خەڵک سەر بە سەر
تیشقەیی ڕۆژێ لەسەری شەونەمم    جوانی دەکا ڕەنگی گوڵی سوێسنم
دەنگی پەرەندانی دەقاز و قورینگ    سۆزەی شنەی بای لە نەسیمی گزینگ
حەسرەت و غەم یەک دەمێ ناچێ لەگیان    تاکوو بڵێم بەحسێ لە سەیرانی جوان
کانیکەی مام قەمبەر[٣٥]م جێژنانە خۆش    پڕ لەکچ و کوڕ بوو بە جۆش و خرۆش
ڕوون ئاوی کانیەکەی ئەگەر کەم دەبوو    زۆر بوو نەخۆش دەردی بەوی چا دەبوو
دەستوری وابوو کە کەسێک نێو وولات    ئاوی نەخۆش بێنێ لەپێش تاو هەڵات
نابێ کە ئاوڕێکی بدا پشت سەری    تاکوو نەبێ زەحمەتی وی سەر سەری
کوا بیر و باوەر هەیە ئەورۆ بەوان    خەڵکانی ئێستێ هەموو پیری زەمان
کانێکە وێرانە نەماوە ئەسەر    ئاوی نەخۆش کوانێ هەیە لێی خەبەر
ڕێت دەئەوێ گەر کەوێ یادی مناڵ    بەزم و سەفای جێژنە بهێنە خەیاڵ
دەورەیەکی خۆش و بە بەزم و هەرا    ئاخ لە عومرا چۆن بوو کە پیری نەبا؟
ئەورۆ لەسەر قوللەیی شاخانی ژین    چاوم لە دەورانی مناڵی و ئەوین
ڕۆیی لەپێش چاوم و نابینمەوە    ئێستێ بەرە و ئاخری ئەوی دەچمەوە
عومرە سەرە و ژێرە لەشاخی ژیان    فاسیلە مەعلوومم نییە تا نەمان
ئەمما ئیرادە قەوی‌یە نێو دڵی    ژینە بە پیاوانە ببا، بن گڵی
کانێکەێ مامقەمبەرم چون هاتە بیر    خۆشە بدەم شەرحی، ئەوی بێنە بیر
هەڵپەرین و شایی جەوانانی شار    گەورە کوڕ و گەورە کچانی، هەزار
بەزمی دەفە و دمبەگ و زوڕنا و دەهۆڵ    خۆشی دەکرد جوانە کچانم بە پۆل
خۆی وەکوو بازارێکی بوو چەندە جوان    پوولانی جێژنانە دەبوو خەرجی وان
بەستەنی و شیرینی دەگەڵ تۆوی سوێر    ماحووم و غووڕرانی و باقلاوە بۆڕ

سـوارە دەهـاتن لە جـحێلانی جـوان[٣٦]
دەنگـی دەڕۆیشـتن هـەتا دووری دوور
هـێندێ بۆ ڕمبازی دەچـوو ئـاشی جـوان
هـەر کـچە جـوورێکی لیـباسی بـەری
سـیرەبی کـەوشانی گـێلاسی دەپـێ
داخـی گـرانـم کـە مـناڵی فـەقیر
نـێو هـەموو ئەو کـەسک و سووران دڵ بەنەم
چـاوی لە ڕەنگـانی لیـباسانی سـوور
کـەوشانی کـاڵۆشی لەبـەر شـۆقی تـاو
گـەرچـی دوو سـێ دۆستی لە هـەم شانی خۆ
ئـاوری دەروونـی بـەوە ئـاهۆن دەبـوو
بـۆیە خـەنەیَ بـەستبوو دەسـتان وپـێ
حـەسرەتە ئـەورۆ کـە بـرا، زۆرتـرە
کـوانـێ کـەسێک ئـاورێ وەئـیدی دەدا
چـونکی بـەڕەی بـردووە ئـاوە، لەشار

پـڕ مـەیی ئـەسبان و خـلەی زەنگـوڵان
خـللەیی ڕەشـمانی دەئـەسپی غـلوور
هـێندێکی لای بـەرغوو و بـەردە ڕەشـان
دەسـماڵی خـاقانی کـراس کـوودەری
بـەک پـۆز و ئـیفادەی دەهـێنن بـەجێ
دەسـتی غـەم و حـەسرەتێ دەکـرا ئـەسیر
چـاوی لە هـەڵپەرکێ دەکـرد زۆر و کـەم
شـیرینی بـەدەستانی مـحللانی ژوور
عـارەقە نـێو کـەوشی دەبـوو گـۆمە ئـاو
دەیـدی کـە هـەڵپەرکێ دەکـەن سـەربەخۆ
ئـەمما بـەدڵ کـوانـێ کـە ڕازی دەبـوو
تـاکـوو لە جـێژنانە نـەمێنێ بـەجێ
دەرد و بـەڵای جـێژنی فـەقیر ژوورتـرە
هـەرکەسە فـیکری بـەڕەیە، ئـاو نـەبا
دەرد و غـەم کـوێرەوەری بـۆتە بـار



کانی مامقەمبەران دە ڕوژانی جیژندا.

# باغەکان[٣٧]

باغی میکایلی[٣٨] و عەزیزئاغا[٣٩]کەمان
مەرکەزی سەیرانگەبی جومعانە بوون
کوا ئەسەرێک ماوە لە نارەی کچان
هەڵپەڕین و شایی ئەویشم نەما
دەنگی دەفەی قادر[٤٠] و عەبلا و مەنیج
باغی عەزیز ئەورۆکە وێرانەیە
کووچەبی باغانی بەپەرژینی جوان
کوانێ بەلاڵووکی قەراغی سەرێ
لاچوو نیشانێکی نەماوە ئەلان
ژینی بەهاری دەخەزەڵوەر کەوت
باغەکەی گوێزێ[٤١]کە ئەویش پڕ دەبوو
بادی دەکەم ژێر داری گوێزانی جوان
دارانی گوێزانی بە جۆڵلانەوە
باغەکەی گوێزێ و خەلیلی ئەوی
باغی عەباس‌ئاغا[٤٢] نەماوە لە دەم
دەنگی دەفە و دمبەکی بن داری نێ
جێی شنەبی بایە لەمیوانی وی
گرمەیی ماشین و هەڕەیی تاکسییە
هەڵپەڕین و شایی نەما بۆ وولات
باغی شێرو خورشید[٤٣] و سەیرانی جوان

نیوێکی وا ئەورۆ نەماوە لەوان
چۆارشەمەیانیش هەمیشە پڕ دەبوون
ژێر داری قەیسی و لە بن گوێزەکان
ئەو هەموو ئاواتە لەبن تێکدرا
دمبەکی ڕەحمانی بە قامی مەنیج
کوانێ دوودڕک و گوڵەزەردەی هەیە
ئێستێ خەیابانن و پەرژین نەمان
کن دارەکێوژانی قەراغ جۆگە بێ
ئەو هەموو دارانە لەبن تێکدران
عومری ئەمەش عەینی وەکوو وی فەوت
بۆتە بەخانوو و خەیابان هەموو
دەنگی دەفە و دمبەک و کیژانی جوان
بەرزە کچی جوانی دەسوورانەدەوە
کوانێ قەڵەم تافەتی شەرحی ئەوی
خانوو و خەیابانە ئەویش زۆر و کەم
هیچ ئەسەری مێشە و دارانی نێ
ڕەنگی ترێی جوانی قەناوانی وی
هەرکەسە جوورێکی غەمی پوولی‌یە
دەرد و غەمە ژینە، هەتا تاوەهەلات
کووچەی هەشت میتری‌یە ئەلعانە گیان

وەختێ بە کووچانی ئەوێدا دەڕۆم    قیژە و ناڵینی خەڵک دێتە گوێم
قیژە و ناڵینی کچ و پیاو و ژن    دایک و کوڕ و نەنک و برای پێش لە من
وا دەکەن هاواری بە قیژە و هەرا    دەنگە بە خەڵکانی دەدونیا بگا
«تو خودا عەزیزانی کە نەودیوە جێ    ئێرە هەموو باغ و گوڵ و پڕ ترێ»
«دارانی پڕ میوەیی وی چەندە جوان    ئەورۆ کووچە و خانوو، بە ڕەنگ ونیشان»
«ئێمەش وەکوونگۆ هەموو رۆژێکی لاو    مەستی جەوانی و تروسکەی هەتاو»
«ئێستێ نەماوین و جێگا بن گڵی    نالانی کەوشانوو، دوو چاوی دڕی»
«مانعی نێ ئەو هەموو عەزێتی وا    فاتیحەیەک رووحی ئەمە خۆش دەکا»
«ئێمە نەمانزانی ژیان یەعنی چی    ئەنگۆ بە خۆرایی لە دەستو نەچی»
«سیدق و سەفا، پاکی ئەساسی وەبە    غەررە مەبن ئەورۆکە پوولو هەیە»
«بەخودا هەموو دەوڵەت و ماڵمان هەبوو    سەروەت و زێر و سەر و سامانی زوو»
«دەستی بەتاڵ کەوتینە چاڵی ئەوا    ئێستێ کە موحتاجین بە یەک دوو دوعا»
«داخە لە دڵ دەرکەیی ژین بەسترا    فرسەتی رۆژێکی بۆ چاکە نەما»
«تاکوو عومر ماوە تەقەللا بکەن    سەروەت و ماڵیشو بەڕێی خوا بدەن»
«بۆ بەدەستهێنانی شەو و رۆژێ کار    تۆ خودا دروستکاری مەدەن بۆ کەنار»
«چاکەیەکی کەو رۆ دەکەن، وەک چرا    هەڵ دەکرێ ماڵی قەبر روون دەکا»
«حەیفە بەغەفڵەت ژینی ئێمە برا    تا لە خەو هاتینە خەبەر چی نەما»
«چاوێ لە دارانی حەسارانو کەن    گوێ بەشنەی بەرگ و گەڵای جوانی دەن»
«هەرچی دەلەرزێتەوە ئەو دەستی با    داخێ دەبینێ لە ئەنگۆ خەتا»
«ئەو گوڵە سوورەش لەقەراغی حەسار    جوانی لە روخساری مەبە یادگار»
«ئاوی نەدەن غونچە و گوڵ سیس دەبێ    رووحی ئەمەش وەک گوڵەکە زیز دەبێ»
«وەختێکی سیسە گوڵەکە، نێو حەسار    کوانێ حەسار خۆشە گوڵانی بەهار»
«وایە وەسێتی مە گوڵانی ژیان    فاتیحەیەک ئاوێ دەدا ژینمان»
ئەودەمی دوای ئاوێ، هەمیشە گەشین    گەر لەژیان بانە لەمان، بێ بەشین
فیکرێ نەکەن بێ خەبەرین مە لەماڵ    رۆژێ هەزار دەفعە لەمە ڕوونە حاڵ

## یەرغوو ـ بەردەڕەشان[44]

داشامەجید بەردی بناغەی وولآت — ئەی بەسفەت کێوی بەرێزی خەبات
جینسی بەشەر غافلە ئەورۆ لەکار — فیکری چی‌یە؟ کاری چی‌یە؟ ڕۆژگار
بۆ بەوجوود هاتووە نێوی ژیان؟ — خیلقەتی مەنزووری چی‌یە بۆ زەمان؟
تاکوو عومر ماوە تەفەلا بکەین — ڕوو دەسەفی پاکی هەژاران بکەین
ژینەکەی دونیا، دوو سێ ڕۆژەو تەواو — پوولّ و منالّ جەمعی دەبێتن بلاو!
تاکوو دوو چاومان لەسەر یەک داندرا — شیوەن و هاوارە ... فلآنی ... نەما؟![45]
چەندە لەئەوشارە خەلّک هات و چوو — هەرکەسە فیکرێک و خەیالێکی بوو
یابە جەوانی بوو سەفەر یا بەپیر — ئەورۆ لەمێژ سالە کە لێی نایە بیر
وەختێکی دونیایە وەفای وابە بۆت — گیانی برا لێرە بکە فیکری خۆت
حەسرەتە فایدێکی نی‌یە کاکە گیان — وەختێکی کەوتیوە بە جێی و بەبان
ئێستێ هەچەندێکی دەتوانی لەمالّ — بیدە فەقیر، گەرمی بکا مالّ و حالّ
مەیخە وە ژێر پێی خۆ کەکەوتی سەروو — حیفزی شەرەف چاکە، گەل و ئابروو
زیندەگی هەورازە، بلّیندە و نەوی — ڕۆژێ نەوی، ڕۆژێ بلّیند و قەوی
عومرە کە هەر ئەودەمە نێ چاوی من — ڕۆژ و شەو و سالّ ئەیامانی دبین
وابژی گەرکەوتنی وە ژێر پێی‌یەدا — ڕوحمی هەبێ خەلّکی بەتۆ بێ بەلاّ



ڕۆژانی سیزدەی هەوەلّی جەمعی سالّ — بەردەڕەشان پڕبوو لەمالّ و منالّ
بەردەڕەشان دەور و بەری بەرغووە — زەوقی نەماوە کە خەلّک مردووە
عار و عەیب هیچ نەبوو. سیدق و سەفا — جەمعی کوڕ و کچ هەموو خوشک و برا
دەور و بەری یەرغووی جوان پڕ دەبوو — ئاوێکی ڕوونی هەبوو وا پیس نەبوو

هەرکەسە جوورێکی غەزا لێدەنا
دۆڵمە و خۆرشت و برینج، هەرچی با
هەر لە بەیانی زوو، هەتاکوو شەوێ
خەڵکی لەیەرغوو بوو لەسەیرانی وێ
کوچکئاور و دارە بەڕوو بۆ غەزا
شۆقی چرای تۆزی لە دووری دەدا
دەنگی بڵیندی گرامافوونی خۆش
قامی قەمەر، قامی کەریم، سەیدی خۆش[46]
شەپۆلی یەرغوو وەکوو دەنگی هەور
ڕۆستەمی داستان و بەدەستی تەور
پۆل، پۆلە خەڵکی لە سەری سفرە خۆش
فوڵتەی سەماوەر بە ڕەژی پڕخرۆش
هەرکەسە دوای نانی لەدەوری ئەوی
قاپ و دیزە و کەوچکی دەشوشتن بەوی
بەزمی منالانی لیباس کەسک و سوور
هەڵوا فرۆشانی بەشیرنانی جوور
هیچی نەماوە لە هەرای ئەو دەمی
ئێستێ کوورچە و خانوو، هەزارە غەمی



سێزدە چخۆش بوو لە قوپێ مەولەوی[47]
دەشتێکی زۆر سەوز و بەجارێک زەوی
تەقنەقە بەردانی قەراغی گراو
داخە..نەما، عومری ئەوی بوو تەواو
ئێستێ لەبن ئاوە وجوودی ئەوی
گرتوویە ئاو ژێر خۆ بە سەددی قەوی
کوانێ نیبێی فێنکی چنارانی جوان
کوا مێشە دارانی بڵاوی، نەمان
ئەورۆ جێگای بەزم و مەلەی لاوی شار
کەس نیێ کە یادێکی بکاساڵی پار
یادێ لە ئەسحابەی سپی[48] چۆن بکەم
نێوێ لە چواربەردە[49] لەکن وی نەبەم
زۆر بە گرانی دێتەوە یادی من
دەشتی عەلیئاباد[50] و سەیرانگەی قەدیم



باغی شێخی[51] ئەورۆ نەماوە جێگای
مەیدانی حەیوان و حەمامە ڕێگای
دارانی نێو باغی هەموو هەڵبڕا
بۆتە خەیابان و بەماڵ و ڕێگا
نێو شاری چەند دوور بوو هەتاکوو ئەوێ
ئێستێ وەسەت شارە، هەرایە شەوێ
ژێری نیبێی دارانی سنجوانی وی
چەندە بوو کاروانچی دەنووستن بنی
یادی کەرزانی لەبن دارەکان
ئاوە لەنێو شاری، سەری گومبەزان

هـێلانە کـۆترانـی(٥٢) بـەدەستی مـناڵ
کـۆترە ئـەسیر دەکـرا بـیدوونی مـەجال

عـەینی وەکـوو مـەکـە بـە دەسـتی زەمـان
بـووینە ئـەسیرێکی ڕەش و بـێ‌نیشان

لاڵ و زبـان قـفڵی لەسـەر بـۆ کـەمێ
هـەروەکـوو پـەروانـە سـووتاوی شـەمێ

هـەنگوینە، نـێو زار و زبـان تـاڵە هـەر
سـەبر و سـەفا و خـۆشی هـەلاتۆ لە سـەر

پـێ لە سـەری لێـوی قـەبەر بـۆ نـەجات
بـەڵکوو کـە هـەستن لە خـەوێ خـەڵکی مـات





بەردەرەشان کە العان نیزیک پردی شەورەنگی جیگایەتی.

## سێ ئاش[٥٣]

داشا مەجید وەختێکی قاز و قوڕینگ ... دەچنەوە گەرمێنێ بە دەنگی گڕینگ[٥٤]
ڕێزێ دەبەستن لە حەوا پێکەوە ... یەک سەف و دوو سەف و یەکێ پێشەوە
پێش دەکەوێ یەکێ قەوی بێ لە باڵ ... دوا دەکەوێ هەرچی زەعیف بێ لەحاڵ
گا، لە سەری دەشت و لە بەحرو لە کێو ... مەسکەنێ دەگرن کە نەبن دڵپەشێو
هەرجێیە وەختێکی کە فرسەت بگا ... ڕاوچی تفەنگێ لە سێ چوارێک دەدا
دەیخاتە خوارێ لەحەوا قازی جوان ... دەیبا بۆ نێو ماڵ و مناڵ و کەسان
ئەمما ئیرادەی سەفی قازی حەوا ... کەوتۆتە سەر وەی کەبچێ ڕێی ئەوا
هەرتیژە باڵی دەکوتێ بێووچان ... تاکوو کەمێ کاتەوە ڕێی بێنیشان
تاکوو دەگا مەقسەدێ هەرکەم دەبێ ... ڕێی ئەوا کوژران و برینی دەبێ
گەر دوو هەزار بێت و یەکێ زیندوو بێ ... قازە بۆ گەرمێن دەبێ ئاخری بچێ
بۆیە کە تەسمیمی لە سەر ڕێی وەیە ... ڕەسمی ژیانی هەموو نەسلی وەیە
ڕازی ژیانە، دەبێ بڕوا ئەوە ... تاکوو چرای نەسلی نەکووژێتەوە
چەندە لە شارانی غەریبی دەبێ ... بەعزێ نەخۆش ئاخری ناگاتە جێ
ئاخری کە پایانی سەفەر هاتە سەر ... قاز و قوڕینگ پێکەوە جێژنیان لەبەر
ژینێکی تازە لە بناغەی لە ماڵ ... سازی دەکەن چەندە بە جوانی و جەلال
جێژنە و جێژنە هەموو شادن لەوێ ... یادی ئەوانەی نەگەیشتن بەجێ
زیندەگی ئاوابە عەزیزانی من ... ئاواتە گەر دوورە بە دوویدا بچن
نێوی ژیان بەند و پەژاری هەیە ... دوای شەوی تاریکی ئەوی، ڕۆژەیە
چەرخە ئەگەر دەکوتێ ئەوینی گەلان ... ژێری ئیرادە، دەشکێ دەست زەمان



ئاشانی جوانیش لە خەڵک پڕ دەبوو
عەکسانی جوانیان لێ‌دەگرت زوو بە زوو

چاو و برۆی جوان و سپی ئاشەوان
بیری دەخست بەفرانی کوێستانی‌جوان

بەحسی سێ‌ئاشانیش بڵێم کاکە گیان
گەرچی ئەماوە ئەسەرێکیش لەوان

ئاوێکی هەڵدێرە لە ئاشێ سەرێ
هاتە سەماکەوتە دەئاشی بەرێ

چونکی سەری کردە ئەوی ئاشی جوان
قەدری هەبوو پێشی پیران و جەوان

چۆنە ئەمەش خۆ بەنەوی دابنێن
نەک وەکوو نەمروودی بەخۆ هەڵ بڵێن

رۆژ و شەوان تاکوو سێ مانگی بەهار
ئاشە دەسووڕاوە بە ئاوی بەهار

بیرێکی زۆر خۆشە زبان ناگەرێ
تا بەعەزیزانی بڵێم حاڵی وێ

ئاوە دەنێو کۆرەگەیی(55) ئاشەوە
چەند بە شلووقی دەچوو بۆ خوارەوە

چەقەنەکەی ئاشی(56) تەماشایی بوو
چەرخی دەدا بەردی سەری ئاشی‌روو

بەرداشی رووی ئاشی بەرەقس و سەما
گەنمی دەڕشت کۆشی‌خۆ ئاردی بکا

بارئاشی دەور و بەری بەردەرکی ئاش
شۆقی فتیلە و فەنەری نێوی باش

هیچی نەماوە ئەسەری بۆ نیشان
کۆنە کتێبێک‌بێ لەدەوری زەمان

ئێستێ لەجێی ئاشی بەرێز، خانووە
دەنگ و سەدای نایە کەئاش نستووە

نە ئەسەرێک ماوە لەجۆگانی وێ؟
نە خەبەرێک ماوە لە بەردانی وێ؟

کێ دەگرێ عەکسێکی ئەورۆ لەوێ
مەنزەرەیی ئاشی لە جوانی بوێ

وایە عەزیزانم، بە چەرخی زەمان
هەرکەسە رۆژێکی دەبێ پاڵەوان

زیندەگی تا پووڵ و پلاوت هەیە
خەڵکە دەگەڵ تۆیە بەکارت هەیە

ئەمما ئەگەر ئەو دووە لاچوون لەکن
مێشە، کە هەنگوینی نەبێ زیز دەبن

عیبرەتە چاوانم، عەزیزانی من
ئەو هەموو نەخشەی کەدەچێ و دێتە کن

رۆژێکی ئەو ئاشە، کەجوانی هەبوو
مەنزەرەیی ئاوی لە هەڵدێر هەبوو

دەوری بەهاوینی گەرم، سارد و خۆش
چای قاوەخانەی سەری ئەو پڕخرۆش

ئاوی نێوی جۆگەلەکەی بۆ دڵان
قامی دەکوت، خورخورە قامانی جوان

رۆژێ هەزار عەکسی لەجوانی گرا
ئێستێ چ‌کەس ئاشی بەرێز نێو دەبا

ئاشە ئەما جوانی و فێنکایی ئاو
عومری وەکوو عومری بەشەر بوو تەواو

هەر بەسەفا خۆشەژیان، چاوی من ‌‌ ‌ خۆشە سەفای ئاشی بەرێز بێتەکن
ڕەحمەتی حەقبێ لەبرای ئاشەوان ‌ ‌ ئەورۆ وجوود خاکە لە ئەو پاڵەوان
وەخنێکی خاکین، بۆ ببین سەر نەوی؟ ‌ ‌ بۆچی نەکەین هیممەتی چاکە قەوی؟
زیندەگی وەک نووری چرایە برا ‌ ‌ نەفتی نەبێ کوانێ چرا نوور دەدا
بێتو چرا شۆقی نەدا بۆ گەلێ ‌ ‌ مردنە، تۆخودا بەئەوی ژین مەڵێ!
قیمەتی ئینسانی بە ئەخلاقی چاک ‌ ‌ سیدق و سەفا نێوی دەروونیشی پاک
عەقل و عەمەل پێکەوە هەردوو بران ‌ ‌ چەند شەوو ڕۆژێکی میوانن لەلان
چاکە لە ئەو دوانە لەنێو باغی دڵ ‌ ‌ تۆوێ بچێنین، نە وەباڵێ لە مل
تۆوە ئەگەر شین بوو ژیان پڕ سەفا ‌ ‌ عەقلە، چرای ڕوونە دە تاریکی دا
نەمدیوە کەس وون بێ لەسەر ڕێی ئەوی ‌ ‌ ئیللا کە خواری بێ، لە ئاکاری وی





عەکسیک لە سی‌ئاشی جوان کە خەلکی لە شارانی دوور بو تەماشای دەهاتن.

# چاکەکانی سابلاغ[57]

داشامەجید عومرە بە ئاخر دەگا
شا و گەدا وەختی سەرە مەرگی ژین
ئەوهەموو پۆزەی‌کەگوڵ و خونچە بووی
نیوە شەوێ بولبولی عاشق دەخەو
هەرکەسە سێ‌ڕۆژ و دوو ڕۆژ عومری‌یە
گومبەزە یانە، لە سەری بارەگا
بێینەوە سەر بەحسی هەموو چاکی شار
چاکەچکۆلە[58] کە نەماوە ئەلان
چاکەچکۆل نێوی دیکەی بوو سەری
چاکە لە دوور قشڵە[59] لەبن دارە بووز
جێگەیی ئەوچاکە بڵێم بۆ گەلان
چاکەکەی شادەروێشی[60] مەشهوور نەبوو
بانگی دەکرد کاهووی شادەروێشی
حەسرەت و غەم فیکری پەراند و بڵاو
گەرچی سەری بڕاوە، سەربڕاوە
چاکەکەی شێخ‌زادە[62] کچی شێخییە
فاتیحەیەک یادی قسن شێخ‌تەها[63]
چاکی مەحموودکانێ[64] لەلای کیژەکان
چاکی مەلاجامی[65] کە دوور بوو لەشار
چاکی خەزایەکە[66] دەگەڵ قوڵقوڵاغ

نایێ بۆ نێو قەبری بە غەیری سەفا
چەندگەزی خامی دەگەڵە بێ‌سەرین
بابەکی تووند هات و هەموو چوو لەدووی
بێ خەبەرە حاڵی بەسەرهاتی شەو
شایە، گەدا مەقسەدی بن عەرزی‌یە
حەبسە لەبن خاکێ چ شا، بێ گەدا
چونکی هەر ئەورۆکەیە خۆزگە بە پار
یادی بەخێر بێتن لە دەوری زەمان
خاڵەسوورە چاکێکی کەم مشتەری
دەوری هەموو بەردی بڵێند و کرووز
مەغریبی چوارێگەیی دە ئازادەگان
کاهوویی مەخسوسی، بەنێوی هەبوو
جوابی دەدا دەرمانە بۆ نەخۆشی
یادی بکەم چاکی بەرێز سەربڕاو
چاکی بەرێزی سەربڕاوە[61] ماوە
قەبری لەکن قەبری بەرێز قازی‌یە
پاک و بەرێز ماوە لە قەبران جوودا
مەقسەدی چابوو بۆ مەرامی دڵان
ئێستێ وەسەت شارە قەبر تارومار
دوور و بڵێندکەم کەسە دەیگرت سۆراغ

چاکەکەی لاچینی[٦٧] بە داشقەی دەچوون     پیاو و ژن ماڵ و مناڵیش دەبوون
هەم سەیرو هەم سەری چاکی بەرێز     یادی دەکەم شاخ و تەلان و پەرێز
حاجی مامیان[٦٨] چاکێکی چوار شەمەیە     ئەورۆ عەجەب نێوی لە یادان هەیە
کەم کەسە بۆ چاکی سەری گومبەزان[٦٩]     رێیە دەچوو چونکی کەدوور بوو مەکان
خوشکە ژنی پیرم لەبەر دەردی پێ     رێیە دەچوونیوەیی رۆژێکی رێ
گەورە کچانیش لە بۆ چلدانەکان     رێیە دەچوون پێکەوە گەڵ پیرەکان
خەتمە لەلام بەحسی هەموو چاکی شار     یادو لەسەر چاکە ببێ بەرقەرار



مەنزەرەریەک لە سابلاغی خوشەویست کە کاک کریم انوری عەکاس سالی ٣٢ هەلیگرتووە.

## «گەڕەکەکانی سابڵاغ(۷۰)»

داشامەجید وەختێ زرینگاوە شەو    دەنگی سریلەی دێ لە ماڵێ بە قەو
نەمنەمی بارانی سەری پەنجەرە    دەنگی دەگەڵ خرپەی خەو تێکەڵە
کوا خەبەری تێرە لە برسی دەبێ    بەعنی فەقیر رۆژی چلۆن شەو دەبێ
یا شەوی سەرمایە لەبن لێفە کۆن    چۆنە خەوی بەو هەموو سەرمایە چۆن
سوزەبی زریانی لەنێو ماڵە وی    دەرد و غەمە رۆژی، هەتاکوو شەوی
گریانی منداڵی بۆ کەوشانی جوان    دیتوویە بەردەرکێ بە منداڵەکان
یا لە لیباسانی دڕاوی ئەوی    پارچەیی چل پینە، ژیانی ئەوی
حەسرەتە، کەس فیکری لەسەر وانە نێ    ژینی فەقیر دەردە و دەرمانی بێ
یادی گەڕەک ئەرمەنی(۷۱)، حاجی‌حەسەن(۷۲)    بەینی ئەوان شەڕ دەکرا تەن بە تەن
گا دەبوو ئاشتی لەنێوانی ئەوان    گا دەبوو دەعوا و شەڕو فوڕپێوان
تا لە چ‌لایەک بێ گەڕەک، ڕزگەیان(۷۳)    یا گەڕەکی وێنجە و تەسبیتەکان
تا گەڕەکی باغی سیسە نێوی بوو    لای گەڕەکی حاجی‌حەسەن بوو لە دوو
یەک گەڕەکی دیکە بەنێو قیلە بوو    لای گەڕەکی ئەرمەنی بۆ شەڕ دەبوو
مانگی عەزیزی ڕەمەزان جەمعی شەڕ    نێو گەڕەکان قەڵشی بە گۆپاڵی سەر
چەند شەر و دەعوا بوو بە گۆپال و دار    لێی دەدرا خەڵکی فەقیرو هەژار
شەش گەڕەکی(۷۴) لێ‌بوو مەهابادی جوان    ئەرمەنی و حاجی حەسەن، ڕزگەیان
سیسە وقیلە وگەرەکی شوانەکان    وێنجە و قوولْقەبرە و تەسبیتەکان
وێنجە، تەسبیت، گەڕەکی (شوانەکان)    جەمعی ئەوان قوڵە قەبر، (رزگەیان)
بەسە، لەبارەی شەڕێ بەحسێ نەکەم    یادی قەڵاکۆن(۷۵) و تەماشای بکەم
ئەو سەری شاری کە قەڵاکۆنە بوو    ئەو سەرە حاجی‌ڕەشە(۷۶) چایخانە بوو

کەم کەمە وەختێکی دێهات هانە شار
شارەکە پڕ بوو هەموو خەڵکی هەژار

شار لقی لێبووەوە لە ئەولای سەروو
نێوی کۆپین‌ئاوا[٧٧] دوو سێ ماڵە بوو

خوارەوەکەی شاری کە ماڵ سازکرا
نێوەکەی جرت‌ئاوا[٧٨] لە سەر داندرا

دوابە ریحان‌ئاوا نێوی کەوتە سەر
ئەمما زوو ئەونێوەی لەسەر کەوتە دەر

تاکوو نیزیک هاوینێ چۆم کەم دەبوو
ڕێی ئەحەدێک بۆ بەری چۆمی نەبوو

ساحێبی بێستانی دەگەڵ باغەکان
ماندوو دەبوون وەختێ دەچوون باغەکان

بۆ بەری چۆمی دەچوونە پردی‌سوور
ڕێی دی نەبوو غەیری ئەوە هێندە دوور

خەڵکی دێهاتی هەموو بەو ڕێبەدا
نێوە شەوێ ڕێ دەکەوت بۆ ڕێگا

دوابەکە چەند ساڵ و ئەیام بوو گوزەر
پردە[٧٩] لەسەر چۆمی درا بۆ گوزەر

ماشینی وورمێیە، بە وێدا بچێ
چێی دی نەچێ پردی سوورە، دوورە ڕێ

ئەوکایە مەحموودکان[٨٠] لەوێ سازکرا
یەک دوو سێ ماڵ، دوابەکەوا زۆر کرا

کوانێ لە نێو شاری گەڕەک جوولەکە[٨١]
کوانێ کەنیسە و مەرەسە و کووچەکە

شەمتۆن و شالۆم و زێرێ و داوودە جوو
دێدەنیسان، دانیال و ئەستێرە جوو

هەر یەکە بۆ لایە فری وەک قەلێ
مەیدانی خواردن کە نەما چی دەوێ

راستەی زێرینگەران[٨٢] گۆڕاوە جێ
دەباغی و جوولەکەکان نین لەوێ

شەقەی زەرد و نەنەکەی زێرە جوو
خواردی زەمان کەس خەبەری لێ نەبوو



## قەبرستانی سابلاغ[٨٣]

داشامەجید دار و درەخت هاتە گوڵ ... باری گوناهانی دیکەم کەوتە مل
بولبولی عاشق لە سەری شاخی دار ... دەگری دەناڵێنێ وەکوو سیمی تار
عومری بە ئاخر گەییوە زیندەگی ... عەقلە ڕێگام نادا بکەم بەندەگی
دەنگی برووسکەی هەور هاوار دەکا ... بەندەبی هیچ کەس نەبی غەیری خودا
بزنی وەنەوشەی کە دەپێچی لە کێو ... شێتی دەکا گەورە کچانی پەشێو
ئەو هەموو هاوارێ دەکەن، غافڵان ... کەنگێ دەکەن یادی خودا و مردنان



کێیە بکا یادی لە قەبران و دار ... دار و درەختی، وەکوو باغی، هەزار
چی بە سەری هاتەوە دار و گەڵا ... کێڵە چی لێ هات و بە کوێدا برا
نانەخۆرم[٨٤] کێڵی نەماوە لە جێ ... نۆبەتێ ئەورۆ بە حەبان جێ بە جێ
بەردەروونان[٨٥] کێڵی نەماوە لەبن ... رووحی عەزیزان بە حەوادا فرین
کێلێکی نێوکون[٨٦] بوو لە نێو قەبرەکان ... دەرمانی کۆخەڕەشە بوو بۆ گەلان
هەرکەسە بێبابە لە ماڵێ نەخۆش ... دەسرەی دەخستە، کونی ئەو کێڵە خۆش
دەسرە کە چوون کەوتە کونی کێڵەوە ... کۆخەڕەشە چا دەبوو ئەودەم بەوە
کوانێ دیوارانی قەبر لێی ئەسەر ... کوانێ لە دەروازەیی مردوان خەبەر
ژێر سێبەری داری بە هاوینی داغ ... فێنک وەکوو ئەوسەری ماینبلاغ[٨٧]
نێوی نەماوە لە ئەسل پشتقەلا[٨٨] ... ئێستێ خەبابانە و قەبران نەما
ئەورۆ هەموو کاری مە بەدبەختییە ... زیندەگی ئەورۆ کە بە زۆرسەختییە
حەیفە بەخاتری دوو سێ رۆژە ژیان ... تاڵی بکەین عومرە بە ئاخر زەمان
ئەو هەموو خەڵکانە لە ئەو شارە بوو ... هەر کەسە جوورێک و خەیاڵێکی بوو

فەعلە و ئاغا و لەفەقیر و گەدا — کەوتەوە بن قەبری کە کێلی نەما
چەندە بە ئیفادە قەدەم دادەنێین — خۆ بە زل و خەڵکی بە کەم دادەنێین!!
ئاخر، لە ژێر پێیە هەزاران جەوان — ڕۆژێکی ئەهلی قەڵەم و دیوەخان
عەینی وەکوو شا بوو، ژیان بێ خەیاڵ — ئەورۆ لەژێر پێیە بەجاه و جەلال
هەرچی بەسەر خەڵکی بهێنی ئەتۆ — دێتەوە سەر، هەرچی بوو ئاکاری تۆ
زیندەگی ئاوێنەیە گیانی عەزیز — ئاکاری ئینسانی دەوێندایە ریز
دەتباتە عاسمانێ، ژیانی زەمان — هاودەمی ئەستێرە گەش و مانگە جوان
وەختێکی زانی کە گوزراوی ئەتۆ — ڕووی دەسووڕێنی لەتۆ بێ گوفت و گۆ
ئەو هەلە دەکوتێ سەری عەرزی سەرت — تاکوو هەرا هەستێ لە دەور و بەرت



## قەبری پیرێژنێ [٨٩]

یادێ لە پیرێژنێ لە قەبری نەماو — کوا ئەسەری ماوە لە سەر ڕێی گڕاو
هەرکەسە حەوت بەردی بەوی دادەدا — بەردە لەسەر قەبری بە کۆماکرا
ئاخری کۆما بەردیش هەموو هەڵگرا — کوا ئەسەری قەبری پیرێژنێ نەما
چەندە بە ڕق بەردە دەکوترا لە قەبەر — پیرێژنی فەرهادکوژە نێتی ئەسەر
کەس نەبوو داستانی بزانێ چییە — بەردی دەدا حەوتە لە قەبری وی بە
گەر ئەتۆ ڕێگات بە ئەوێدا هەبا — حەتمی دەبوو بەردت بەوی دا بدا
پیرە، کە وەختێکی کەوت نێوی شار — ژینی هەزار جوانی فڕاندن بە جار
فیکری دەکرد هەرئەوە ئاوا دەبێ — نەیزانی ڕۆژێکی قەبەر جێی دەبێ
زۆر پاڵەوانی نەبەزی مل قەوی — قەبرە کێشانی لە بلیند و نەوی

## قەبری جوولەکە و ئەرمەنی [٩٠]

ئاساری قەبرانی فەلە، ئەرمەنی — کوانێ لەنێو شاری نیشانێک لەوی
جوولەکەشم قەبری نەماوە و نیشان — جەمعی هەموو تێک‌چوو بە ڕۆینی زەمان

## «قورئان خوێنەکانی قەبرستان»[٩١]

دەیـــخوێند لەســـەرقەبران دووحـــافز قـوران
مـەللا مـوحەممەد[٩٢] بوو ئیدی نێو عـەلی[٩٣]
هــــەرکەسە قــەبرێکی بــدابــا نــیشان
یــەک یـــەک هــەموو قــەبری دەنــاسینەوە
ئــەمما لە هــەرجـــێیە بــبا ئــەو عــەلی
نـــتووە ژێــر قــەبری کــە خـوێندی ســەری

هــەردوو چدەنگ خـۆش بـوون نـەماون ئەلان
کـــوێر بـــوو وەلی ڕوون دوو چـــاوی دڵــی
تـــاکـــوو بـــخوێنن لەســەری قــەبری وان
دەیـــخوێند دوو ســـێ ئـایە لە قــەبری ئـەوە
بـــۆنی عـــەتر پـــڕ دەبـــوو دەور و بـەری
ئــێستێ هــەموو خـــانووە دەور و بـــەری



ئاو هەلدیری ئاشی دووەم لە سیئاشی جووان.

# کاروانسەراکانی سابلاغ[٩٤]

داشامەجید سۆزە لەبای وەعدە هات
عالەمی پیر بوویی دزێو بوو جەوان
سەوزە لە دامێنی تۆ پەیدا بووە
جوانە گەزیزانی لە دامێنی تۆ
حەیفە لەدامێنی تۆ کانێک نییە[٩٥]
سەوزە لەقالبی تۆ بەسەد ئارەزوو
دوایە دەبێ زەرد و زەعیف لێو بەبار
تەجرەبەیە دەرسی گرینگ بۆ گەلێ
کوانێ وەکوو سالی قەدیم قەدری تۆ
هەرکەسە جووریکت تەماشا دەکا
بەردەکەی دەرویشی[٩٦] لەتۆ مال جودا
چەرخی زەمان حیلە و مەکری هەزار
شەرتە بە ئینسانی ژیان شاخی جوان
شاخ و درەو و گیایی تۆ میسالی ژیان
زۆرم ئەتۆ دیوە دەئەو شارەدا
ئەمما لەدوای چەندی هەتاوی مەتین
قەدری بەهارانی تۆ، ئەورۆ نەمان
رۆژە و رۆژگارەعەزیز چاوی من

بەفرە لەسەر شاخ و لە دەشتان هەلات
بولبولە سەر شاخی گولانە ئەلان
عەینی سەید شالی لە پشت بەستووە
دێنە دەرێ بەرگ و لیباس تازە بۆ
ئاوی بدا سوورە گولانی دیبە
دێتە دەرێ عومری فەقەت رۆژ و دوو
عەینی بەسەرهاتی وەکوو سالی پار
گیایە لەسەر پەنجانی خۆ، شین دەبێ
کەس نێ سلاوێکی بکاتن لەتۆ
بزن ومەریش رێی لە رێگات لادەدا
پشتی دەتۆ کردۆ نەبینێ جەفا
هیممەتە، زۆر مەکری دەباتە کەنار!
فایدەیی کوانێ هەیە سەرکوتان
گیانی برا غەفلەتە تاکەی لەوان
وەختی بەهار سەوزی بەخۆشی و سەفا
گیا و گژی کردووی خەلوسێک بەتین
نێتی وەفا گیانی برا بۆت زەمان
قودرەتی ئینسانی بلیند و نەوین



| | |
|---|---|
| بێمەوەسەر وەزعی وولاتانی خۆم | «گیانە بڵێ باسێ لە ئەو شارە بۆم» |
| چەندە لەشاریم دیوە کاروانسەرا | شارە، کە گۆڕاوە نیشانی نەما |
| بەکێکی جێی بەرگن و مازوو و خوری | نێوی کەریمخان[٩٧] و سەرای سێ‌دەری |
| دەرکەیەکی لای بەری توونخانە بوو | دەوری حەسارانی هەموو حوجرە بوو |
| نێوی قەپانێکی لەمیچی دراو | کاکە عەبوولخالەقی[٩٨] مەئموور کراو |
| حەوز و فەوارێکی بڕێک جوانی نێو | حەوزە لە بەردی بوو فەوارەش لە ئەو |
| دەرکەیەکی دی سەری مەیدانی ئارد | سوور و زەلام ماشێنی پێدا دەهات |
| نێو دوو حەسارانی کە یەک دەرکە بوو | راستی ئەوێ گەورە قەپانی هەبوو |
| جێی کەتیرە و بەرگن و مازو و خوری | تالەبنێشت، هەرچی کە تاجر کڕی |
| دەنگی کوتک، بۆنی دەتووتنی لەوێ | پشمین و کۆخبنی دەخستن وەڕێ |
| نارەی کەچۆلانی کەتیرە لەپێش | دەیبرد لە دڵ جەمعی غەم و دەرد و ئێش |
| دوایە بڕێک خوارەوەتر ئەوسەرا | شێخی[٩٩] هەبوو نێوێکی کاروانسەرا |
| بەینی کەریمخان و کووچەی جوولەکان | کاروانسەرای شێخی بوو نێوانی وان |
| کاروانسەرای سیمۆنی[١٠٠] بوو، روو بەوی | ئێستێ لەوێ ماوە بەدەرکی نەوی |
| کاروانسەرای کۆسە[١٠١] و بەرداشی[١٠٢] جوان | بۆتە بە نێو ماڵ و دوکانی کەسان |
| کاروانسەرای سەیدعەلی[١٠٣] نێوی نەما | بانکێکی میللی لە جێگای ساز کرا |
| شێخی و سیمون بوو جێگای یەکسمان | حەیوان و ئەشتێکی دەنێوی کران |
| شێخی زەمانێکی بە دوو بەش کرا | خوارەوە کاراژی لە جێی داندرا |
| کاراژی میهەنتووری داندرا لەوێ | حاجی‌سمایل[١٠۴] بوو لە کاراژی وێ |
| بادی سەرای مووسلێکانم[١٠٥] بەخێر | هیچی نەماوە لە سەرا بێتە بیر |
| کاروانسەرای تاجرەباشی[١٠۶] نەما | ئەسل و ئەساسی لە بناغەی بڕا |
| جێی ئەوی مەیدانی حەمەخرچە[١٠٧] بوو | نیزیکی کووچێکی بڕێک گەورە بوو |
| دەرکی دوو خواجانەبی جوانی لەپێش | دەرکەزەلام. باڵکۆن و هەیوانی پێش |
| پەنجەرەکانی بوو بەمۆدی فەدیم | ئاساری نێک‌چوو لە شستانی کە دیم |
| لای سەروو تاجرنشین. هەیوانی پێش | خوارەوە جێی ئەسب ومەرو گوێدرێژ |

نـــێوی حـــەساری وی کـەحەوزێک هـەبوو        فـــەوواره ئـــاوی بـــۆ حـــەوا هـەڵدەچوو

X



قەپانی کاروانسـەرای کـریم خـان کـە تـاجرەکـان بـو کـیشانی خـوری و بـەرگن...
ئیستیفادەیان لی دەکرد.

## گڕاوەکان[١٠٨]

یادی گڕاوانی قەدیمم لە بیر — هاوینێ خەڵکی لەبۆ نۆبەی ئەسیر
خەڵکی بە پێیان و بە داشقەی دەچوون — پیر و جحێڵ، ماڵ و منالیش دەبوون
کوانێ گڕاوە لەبەری شاری ما — کوانێ گەپ و شلپە و گڕمە و هەرا
راستی عومر جۆگەلەیە پڕ لە ئاو — خەڵکی قەدیم شاری، هەموو بوو بڵاو
هەرچی دەکەم چاوێ لە خەڵکی وڵات — نابینم ئەو خەڵکی قەدیمی وڵات
دەیبینم تاقتاقە لە خەڵکی قەدیم — رەنگی زەعیف، مات و مەلول، سەرسپیم
رەفتار و ئەخلاقی قەدیم وون لە شار — هەرکەسە جوورێکە لەسەر تا بەخوار
بایە بە توندی دێ دەگەڵ خۆ دەبا — کۆنە دەچێ، تازە جێگا پڕ دەکا
بەفرە لەسەربانی سەران کەوتووە — زۆری نەماوە کە بڵێن مردووە
هەر شتە ئاخرێکی هەیە نێو ژیان — ئاخری ئەوش نابێ لەسەر نێردیوان
یا دەڕزێ پایەیی ئەو نێردیوان — یا دەشکێ پللە بە دەستی زەمان
تازە کە هاتبوو لە ئەوەڵ چەند عەزیز — هەرکەسە لایەک بوو لە مەیدانە ریز
ئەمما کە وەختێکی وە کۆنە گەرا — بەزم و سەفا و خۆشی فڕی بۆ حەوا
هەر پەر و باڵی دەکوتێ نێو ژیان — خۆشی بڵبند بۆتەوە: بۆ ئاسمان
چاو هەتەرێ ناکا ببینێ ئەسەر — راستی کەسێک نیتی لە شکلی خەبەر
دەستی تەبیعەت کە گەرا نالەبار — هەردەمە دەردێکی دەهاوێتە خوار
دەردە و دەرمانی بدە ئەی خودا — عومرە کە نەیماوە لە پێشم بەقا
باسی قەدیمیە لە پیرانی شار — هەڵمە کەبوو هەورە، بە ئاو دێتەخوار

## تاقەدارەکانی سابلاخ[١٠٩]

داشامەجید وەختێ شەپۆلانی گۆم — دەیکوتێ کەنداڵ و قەراغانی چۆم
وەختی بەهارە بە خوڕە دێتەخوار — مەوجی دەدا چەندە بەلەنجە و بە لار
مەستی جەوانی‌یە بە جۆش و خرۆش — هەڵدەقەنێ دار و درەخت و کلۆش
ماسیانی بێچارە بە دەستێوە مات — مەوجە دەیانباتەوە شار و وولات
دایدەگرێ دەشت و شبوەرد و دێهات — خانووخەراب، خەڵکی بە دەستێوە مات
هەر دەکوتێ، دەبڕێ، دەچێ پێشەوە — هاواری ناڵینی خەڵک دێ لەوە
بێ‌خەبەرە نابێ هەمیشە بەهار — مەوجێ بداکوشت و بڕین بێ‌لەکار
ئاخری کەبارانی بەهارێ خەلاس — نامێنێ ئەو شەوق و هەرایە بەباس
ئەو دەمی هیچ مەوجی نی‌یە ئاوی گۆم — پیرە و ئارامە عومر هاتە رۆم
کۆلکە و دارانی لەجێی هەڵقەناو — ریشێکی دووبارە دەچێنن لەئاو
ماسیانی گۆمێش هەموو خڕدەبنەوە — تۆڵەی ئەو زوڵمە دەهەستێنەوە
رۆژو شەوێ فیکرو قەرارێ دەکەن — تاکوو عیلاجێکی نەجاتێ دەکەن
ئەو هەموو هاوارە لەبن گۆمی‌وا — دەنگی بەماسیانی دەدەریا دەگا
بەحرە وەجۆش دێتو شەپۆلێ دەدا — تۆڵەی دەستێنێ لەگۆمی ئەوا
دەیدا بەزللانی لەگۆمی قەوی — ماتی دەکا، زاڵمی وا سەرنەوی
تاکوو ژیانێکی بەخۆشی و سەفا — دەیدا بە ماسیانی گۆمانی ئەوا
زیندەگی ئاوایە براگیانی من — وەختی جەوانی بکە فیکری ئەمین
وەختێکی سەر تەختی ئەوینی بەقەو — خەڵکی مەکە ناڕەحەت و سەربەئەو
هەرچی بچێنی ئەوی دەدرووییەوە — فەرمودەیی شاعیرە شێعری ئەوە
داخە کە قودرەت هەیە نێو دەستمان — چووکە لەبەر غەررەیی حەوت ئاسمان



شارە لەدەوری بوو سێ جێ تاقەدار		یەکێ مەحمودکان بوو سووتا هەربەجار
دووەمی تووی سووری خەزایی[110] هەبوو		خڕکەڵە جوان داری ئەواکەم هەبوو
سێیەمی هەرماوە بەنێو تاقەدار		شاهیدە بۆ گۆشت و بڕینێ لە شار
ڕۆژێکی جەرگت دەدڕم داری من		چونکی لقت مێژووە بۆ شاری من
تۆ سەری ڕێت گرتۆ لەیەک لای شار		کۆنە کتێبێکی لە ساڵانی پار
هەر لق و پۆپی تۆ پڕە باوەڕی		بیرەوەری هەرچی کە دیتت سەری
حەیفە کەنازانم زبانی ئەتۆ		تاکوو دەگەڵ شاخت بکەم گوفتوگۆ
ئەمما ئەگەر عومرە بکاتن وەفا		فێری دەبم ئاخری زبانی ئەوا
تاریخی ئەو شارە لەنێو جەرگی تۆ		دێنمە سەری کاغەزی بۆخەڵکی خۆ
ئەو دەمی گەر مردم نەبێتن عەزاب،		بۆ قەدمی چاکم نەنا بۆ سەواب؟!





گومی تاقەدارە کە ئیستا پارکی سیدقطب ە.

## «تووی سووری خەزایی»

داشا مەجید وەختێ گەزیزە لە شاخ        دێتەدەرێ سوێسن و لالە لەباغ
دەنگی غەریبی نەی و شمشاڵی شوان        تێکەڵە گەڵ ڕەنگی گزینگی بەیان
بابەکی زۆرخۆش دێ لەدامێنی کێو        پێی دەلەقێ بەرگ و گەڵای دارەمێو
قەترەیی شەونەم وەکوو ئەستێرە جوان        شۆقی دەدا تیغی دەکێشێ لەگیان
سەبزە لەژێر پێ بە بەهاوار دەڵێ        «من گوڵی ڕوخساری عەزیزی دڵێ»
«هەڵگرە پێت لەوسەری دووچاوی من        پێی تۆ دەئێشێنێ هەموو گیانی من»
ئاخری ئەتۆ گیانە بەجوورێکی وا        ژێر دەکەوی بۆبنی پێی دیکەدا



کوانێ لە تووی سووری خەزایی خەبەر        تاقە درەختێکی لەسەر کانی بەر
ماری بەنێو بانگی هەبوو شاخەکە        ڕێی دەگرت مارانی لەسەر خەڵکەکە
ئێستێ نیشان کانی و داری نەما        بۆتە بە بازار و دوکان و ڕێگا
نیوەی ڕۆژێک بوو ڕێگا تا ئەوێ        ئێستێ بەیەک لەحزە دەچین بۆئەوێ
بەحسێ لە هەنجیری خەزایی نییە        وەختێ ڕێگای ڕۆژێک دەچووین بۆ ویە
سەیدووکەیی دامێنی لای خواری وی        ئێستا نەماوە ئەسەرێکیش لەوی
گەنمی زەوی و زاری بەکانی بەراو        حەیفە زەوی و زاری ئەویش بوو تەواو
گەنمە و شێوەردە نەماوە لەوێ        جێی ئەوی بازار و دوکانانی لێ
بادی دەکەم دەنگی سریلانی جوان        قرچەیی هاوینێ لەنێو گەنمەکان
ئەورۆ عەجەب بەزم و هەرایە لەوێ        کەس نێ بەهاواری ئەوی دیکەبێ



# گوزەر

## قەیسەری[111]

داشا مەجید عومری بەشەر نێردیوان
سەر دەکەوی پللە بەپللە لەوان

تاکوو دەچێ بۆ سەرێ، دونیای ڕوون
زۆر دەکەوێ چاوی بەدونیای دوون

ئاخری لەسەر، پالە پللەی هەووەڵێ
بەو هەموو ئاواتە دەچێ بن‌گڵێ

گەر لەسەری پالەبنی نێردیوان
یادی بکە خەڵکی هەزاری زەمان

گیانە زەمان نەیبوو بەقا بۆکەسێ
کێ‌بوو لەقانوونی ئەوی دەربچێ

عومرە دوو سێ ڕۆژ و شەوێکە میوان
دەروا لە نێو چۆلی دەکا دیوەخان



تاگوزەر ئاساری نەما وەک قەدیم
جەمعی کەسانی دی لەوێ بوون موقیم

نێوی حەساری لەحەوز، نێ ئەسەر
قەپیانی سەرحەوزە نەما، لێی خەبەر

بەردی دوو پووت و سێ‌پووتی ژێر قەپیان
وون بوو لە پێش چاوی، بەدەستی زەمان

گومبەزی سەربانی ئەویش تێک‌درا
کوا ئەسەری کاری قەدیمی نەما

هاوینێ فێنک‌بوو گزینگی سەبا
خەڵکی لەگەرمان خۆی دەنێوی کوتا

نۆدەر و دەروازەی هەبوو ئەو سەرا
غەیرە یەکێ کۆنە نەبێ چی‌نەما

ساحەبی ئەو جێیە نەماوە ئەلان
پیاوێکی زۆر ئاغا، بەهیمەت لەوان

ماڵی هەمیشە لە میوان پڕدەبوو
ڕەحمەتی[112] نێو، ڕەحمەتی مەولای لەدوو

## «فتباڵیستەکانی سابلاغ»(113)

داشا مەجید ڕۆژێ هەزار جوانی چاک / باب و برا دەفنی دەکا ژێری خاک
دایکە دەناڵێنێ «کوڕم جوانەمەرگ» / خوشکە بەهاوارە «برام چوو لەچەنگ»
ئەو شەوی دوای مەرگێ لەنێو ماڵی باب / شیوەن و گریان و سووتان و عەزاب
دایکە وەکوو لانکێ بەخۆ ڕادەژێ / پوور و برا و نەنکە دەگەڵ خوشکەکێ
وەختێ کە سێ ڕۆژە لەوی دەگوزەرێ / خاکە فەرامۆشی دەدا بۆ دڵێ
یادی کوڕە و شینی لە ماڵێ نەما / عەبنی کە مانگاکە کەمرد، دۆبڕا
بۆیە لەئێستاوە دەڵێم کاکەگیان / خۆت بگری تا نەگرین خزمەکان
دونیا لەکن عاقل و پیاوی سەلیم / ڕێی گوزەرە، پردە بۆ دونیای دیم
پردە مەروخێنە بە پیاوی بژی / تاکوو ئەگەر چوویە سەفەر، هەربی
مەیدانی فتباڵی چ کەس دێتە بیر / نێزیکی سێ ئاشە لەکن نەفت و قیر(114)
یادێ لە فتباڵی زەمانی قەدیم / یادی عەزیزانی قەوی و سەلیم
دەستەبەکیان تیمی کلۆنیبی شار / پێش تیمی تەورێز و مراغەی بەکار
گۆڵیری چاکبوو، بەکری وەستا حوسێن / گۆڵی دەبەست، تاکوو نەبێ سەرشکێن
دوای ئەوی گۆڵیرێکی دی خۆش زبان / قاسمی نێو، شۆرەتی سووڵتانیان
گۆڵیری مەشهووری دیکەشمان هەبوو / نێوی بە عەبلا و ئیسحاقی لەدوو
دوابە بە ئەحمەد، تەوفیق مەشهوور کرا / ژینی لە ئێرانی عەزیز هەڵبڕا
یادی بەگی بەرزو بڵیند، شووت قەوی / قاسمی وەفا نێوی قەدیم گەنجەڵی
کاکە سمایل کە لە جوانی بەجۆش / خولخولە بوو نێوسەری مەیدان و گۆش
کاکە قولە نێوی ئەسل موستەفا / شۆرەتی ئیسحاقی و عەبلای برا
یادی ئارەحمانی نکەم فازیلی / گۆشە و سێنتیر هەموو جێ هەڵقوڵی

بادی سوولەیمانی موعینی لەگۆش     فایقی نێو بەقسە سەری حاڵ و خۆش
قادری ریحانی وەکوو تۆپی جیر     هافبەک و فۆرواردی حەریفی ئەسیر
رەحمانی مەنسوورپوورم ڕەڤ و درێژ     تیمی حەریفی بەدریب کردە گێژ
موئمینی بوو موستەفا سێن‌تیری چاک     بەرزو بڵیند قەدی هەبوو وەک چەلاک
قەدی بڵیند، زیرەک و جوان قەوی     حامیدی نێو، شۆرەتی بابی وەلی
هاشمی‌کاکاغابەعەبنی‌هەلووک     هەڵدەخولی چووست‌وسەری‌حاڵ‌و سووک
هیچی دیکە نایەتە یادم لەوان     خەنمە بناسێنم عەزیز لاوەکان
بەزمەکەی فتباڵی لەنێو خەڵکی شار     شەوق و هەرا و شادی دەهێنا بەجار
وەختێکی دەعوەت دەبوو تیمێک لەشار     خەڵکی بەپێشوازی دەچوو تاکوو خوار
مینەبی لوتفی لەوێ ئالاّ بەدەست     پەرچەمی تا ئەوسەری کەڵکێ بەدەست
کەڵکەکەی بەگزادە لەپێشوازی پڕ     بەرزەکوڕ و پیاوو جەوانانی‌حوڕ





تیم کلنی فیتبالیستەکانی سابلاغ لە مەیدانی فیتبالی، کە جیگای وی دوور لە شاری لە پشتی حەمامی زەندی ئیستا بوو.

# حیکایەت خوێنەکانی سابلاغ[١١٥]

داشا مەجید وەختێ کە خوشکە خەجێ[١١٦]
بـــۆنی ســـیامەندی لەدوور بـــۆوە دێ
ئـاوری دەروونـــی دەکـــولێ بـــۆکـــنی
کـــاکـــە ســیامەندە ئـــەویش بـۆ ئـەوی
رەســـــمی تـــەبیعەت هـــەمیشە نـــالەبار
کـــاکـــە ســیامەندی لەکـێو خستەخوار
تـــۆخودا عـــەزیزان چـــیبە دونـــیا ئـەلان
رۆژێ دەگـــــەڵ تـــۆیە رۆژێ دوژمـــنان
لەوهـــەموو رەنگـــە نـــەگـــرین عـیبرەتێ
عـــاقیبەتی کـــاری ئـــەمە چـــۆن دەبـــێ
شــــەرتە وەفـــاداری دەگـــەڵ دۆســـتان
دوژمـــنە خـــۆی دەمـــرێ دەگـــەڵ حـەسرەتان



شـــار وەکـــوو ئـێستێ نـەبوو میوەی هـەبێ
پـــاییز و زســـتانێ هـــەموو، شتهـــەبێ
هـــاوین و هـــاوینە هـــەبوو مـــیوەکـــان
ئـــەیامی زســـــتانێ مـــێلاقانی جـــوان
کشـــمیش و بـــادام و مـــێلاق شـــەوچەلە
ســـنجو و خـــورما و ســـجووق چـەلچەلە
کـــوا، نـــەبوو رادیـــوکـــە بـلێم گـوێ دەنـێ
نـــەقڵ و حـــیکایەت بـــوو شـــەوێ نـێوگـەلێ
لەو ژێـــــری کـــورسی و لەکـــن کـــورەدار
ســـبدق و ســـەفا زۆر و حـــیکایەت هـــەزار
هـــاتینە ســـەر بـــەحسی حـــیکایاتی شـــار
بـــادی مـــیرزا عـــەبلاّ شـەلەی[١١٧] سـەدهەزار
عـــالەمی شـــاری بـــەقسەی خـــۆش‌دەبوو
نـــەقل و حـــیکایەت خـــوێنیوا قـەتنەبوو
کـوشت و بڕین خـواجە نـەسیم[١١٨] پـووڵەکـی
عـــالەمی بـــەفڕانـــێ فـــروشتۆ یـــەکـــی
پـــــیاوێکی دانـــــا و فـــەقیر و هـــەژار
غـــەرقێ لە ڕەحـــمەت بـــێ، بـلێن سـەد هـەزار
شـــەو لە سکـــەندەر لە ئـــەمیر ئـــەرسەلان
نـــەقل و حـــیکایەت بـــوو لەنـێو مـاڵەکـان
عـــەبلاّ شـــەلە دەیکـــوت لەدوو قـــاوەخان
ڕەحمەتوڵلاّ[١١٩] و کاکـە عـەلاو[١٢٠] بـوون نـەمان
دوای ئـەوی کـاک ئـەحمەدە[١٢١] کـە نـەقڵی کـرد
لای ســـەعیدی بـــەزمی شـــەوانـەی دەگـــرت

سێیەمین نەقتاڵە عەزیز بوو قوڵی[١٢٢] هەردەم بەشکڵێک و بەرەنگێک دڵی
رەنگ و شکڵ ژینی ئەوی دا بەبا هیچ کەسێ نەیزانی چبوو ماجەرا
دوایە میرزا تەوفیق[١٢٣] لەنێو قاوەخان دەستی بە نەقتاڵی چخۆش کرد شەوان
پیاوێکی دانا بوو، سەوادیشی زۆر ئەمما هەموو پووڵی دەدا و وەدکەبۆر
گەرچی عەریزەی دەنووسی لای کەریم پیاوێکی ئاغا بوو مەتین و سەلیم
داخی گرانم کە سەواد زۆری وا عومری تەواوی بە هەژاری ژیا
کاکە کەریمی سەلەمەی[١٢٤] جاروبار بەزمی حیکایانی هەبوو نێوی شار
تاکوو درەنگ وەختی شەوێ هەرهەرا شەرحی حیکایاتی دەدا و ماجەرا





مەنزەرەی گومی پردی سوور کە ئاغای قاسمی الله ویسی لە سەر پردی را شیرجەی لی دەدا.

## قوماری منداڵەکانی سابلاغ[125]

داشا مەجید وەختێ کە مەر دێتەوە / بەرخی لەماڵێ بە دەکارێتەوە
دەنگی مەڕ و شوان و بزن تێکەڵە / هاواری منداڵی چکۆل چەلچەلە
تۆز و غوباری مەڕ و کاریلەکان / تاری دەکا دەشت و زەوی و ئاسمان
دێنەوە دەورێک و زەمانێکی وا / تۆزی ئەمەکێ بە بداتن بەبا
دونیا عەزیزان و برایانی شار / گۆمێکی قوولە، مەلەوانی هەزار
ئەوگۆمە زۆر جوانە کوڕی کوشتووە / ئەوکچە زۆر شووی بەخەڵک کردووە
دونیا کچە خۆی لە هەزار مارە کرد / یەک دوو شەوان دوایە تەلاقی لێ گرت
ئەمما هەزار ساڵی دیکە ئەو کچە / خۆی لە هەزار مارە دەکا، هەر کچە
هیچ ئەسەرێک لەوهەموو مێردانە نێ / ئیللا کە رەفتاری پەسندیان هەبێ



بێینەوە سەرباسی قومارانی شار / لاو و منداڵانی بەتێگرا و بەجار
ئای لە کەری سوور و بە نێو پشت درێژ[126] / خۆش بوو تەماشای وی لە هەورازو لێژ
دزدزێنی نەغەدە[127] نێولاوەکان / هەیجۆ هەیجۆ[128]، حەلۆ حەلۆی بەشەققان[129]
دزدزێنی نەغەدە نێو بەچکەکان / نێوێکی دیکەی هەبوو خۆش بۆ زبان
نێوی دیکەی پشیلەی ماڵە میران / خۆشە قۆمارێک بوو لە نێو کووچەکان
هەیجۆ هەیجۆش نێوێکی دی بوو لەسەر / گوڕزی فیتوو، چاکە هەمان بێخەبەر
قەرێقەرنێ[130] کوڕ و کچ و تۆپ و دار[131] / خەڵکی دەهاتن بۆ تەماشای هەزار
ئەی سوتام و ئەی برژامی[132] کچەکان / دێتەوە گوێم دەنگی لەنێو کووچەکان
دایە مەمەدە بە گورگی تیژە ددان[133] / نێوی گۆڕاوە کە گۆڕاوە زەمان
یادی چەلیک حەمزەل[134] و گوێچکەی ئەوی / دەبکرد جحێڵانی بە باڵا قەوی
دوایە چەلیک گۆرد و چەلیک چۆشە بوو / باقی لە دوای چی دی نەبوو تێک دەچوو

یادی بەخێر کیسەڵی ئەیندرقاشی[١٣٥]
جوابی هەبوو بۆ تێهەڵدانی باشی

کیسەڵ کەچوو بۆ دوای بۆقی بە غەوغا
دە ڕێگادا دڵی تۆقی بە تەنیا

پیس پی سێو گڵاو گڵاوم مەکە
توخودا لە شارانی خودام دەرمەکە

دەستم بە کلیلە و گوڵە پیس ناکرێم
خۆش بوو بە منداڵی گڵاو وا بڵێم

قەرێ قەرێ، ساڵێک و دوو ساڵەیە
ئاواڵە خۆبگرە، نەدەی نۆرەیە

هەتەختە، تەختە، تەختە[١٣٦] نێوی براو
یادی ئەما نێو کچەکان بوو تەواو

کاکە دەچوو ژن بێنێ خوشکە خۆشحاڵ
کچی شابەگوڵ بێنێ بێنێنە ماڵ

گوێنە[١٣٧] زۆر مۆدی نەبوو نێوی شار
ئەمما لە دێهاتیهەرای بوو هەزار

خوززێنە[١٣٨] یادێکی ئەماوە برا
ئێستێ منداڵ کوانی دەکاکاری وا

خەستەکێنە[١٣٩] قوماری بچکۆڵەکان
ئێستێ کەهەرماوە لەنێو کووچەکان

حللوربللورتەککانە[١٤٠] کوا گەورەکان
زەردو سوور و شەممامە بۆبە چکەکان

ئەمن و تۆ ئاواڵین[١٤١] سەدای نایەگوێم
بەجووتەی دەسماڵین لەسەر پەینوپۆم

قرتێن[١٤٢] و مورێن دە دۆڵ دۆڵ میچان
ئەورۆ فەرامۆشە لە بەینی کچان

خوڵ خوڵە[١٤٣] ومەزرەق[١٤٤] و شێلاقەکان[١٤٥]
فرفرە و دار وهەلووکانی[١٤٦] جوان

مێشێن و سێجگەو دووجگە و داهێڵێن
دامێن و قرتێن و چینێنو جگێن

کێ بە فەرامۆشی بکا ئەو پەڕی
دەورەبەکی خۆش بوو کە زوو ڕاپەری

جگ مسی نێوی دەکرا قورس بێ
هاتنی بۆ ئەووغ و میر خۆش بێ

چەندە دەسووراوە کەجگ پەل بێ
تاکوو چکە وتاکوو پکەی کەم هەبێ

بادەوەشم[١٤٧] هاتەوە بیری و حەوا
چەندە بەجوانی لەوێ دەبکرد سەما

چی دی وەبیرنایە لە بەزمی منداڵ
دەسنم بە دامێنو ئەما حاڵ وباڵ

ئەو حاڵ وئەحواڵە وەپیری گەڕا
بەزمی گەڕەک لاچوو ئەماکاری وا

مەشغەڵە ئەورۆکە بە کارتۆنییە
منداڵە چاوی لە هەراو شوێنی یە

حەیفەلەسەرداری لەجێی بولبولێ
دەنگی قەل و قشقەڵە بێ بۆدڵێ

خامۆشە ئەو شارە، لە سەرداری جوان
دەنگ و هەرا نایە بە وەختی بەیان

تاکوو منداڵ هەستن بەهاواری وان
دەرد و غەمە لاچێ لەباغی ژیان

## ئاڵەبووک و بووک بووکێن[١٤٨]

ئاڵەبووكی گەورە كچان بۆ قومار | بەزمی هەبوو رۆژێ لەبان و حەسار
دەسماڵ و چارشێو و كراس و كەوا | جوانی دەكرد بووكە بە بەزمی سەما
هەربەخەیاڵ بووكە دەچوو ماڵە خۆ | بێ دەفەو دمبەگ و بێ گوفتوگۆ
دوایە بە میوانی دەچوین ماڵەوان | بووكە كەبوو چینی ئەوانە نەمان
بەزمی منالی كچەكان تێكدرا | ئەورۆ لە نێو خەڵكی ئەوانە نەما
دەورەبی منداڵی چلۆن پڕسەفا | دەردە نەبوو! ئێشە نەبوو! بێتەلا
هەر زگە تێر بایە خەیاڵێك نەبوو | حەیفە كە ئەو دەورە لە دەستانم چوو
دەورەبی وا نایەتەوە چوو لەدەست | حەسرەتە ئەو یادە لە دەورانی مەست
دەمهەوێ ئەورۆكە هەڵێم بۆ قەدیم | زیندانی پیری بشكێنم كەدیم
بەڵكو نەمێنێ ئەسەرێكی غەمی | زوڵم و بەلای زۆری لە چەرخم كەدی





سه رحه واڵه ئاشه کان که له پشته وه چۆمی یه رغو و و ریگای سه یداوا دیاره

## دێوانە مەشکەڕەش (١٤٩)

داشا مەجید وەختێ کە جووتێرەکان	نیوە شەوێ دەچنەوە سەر مووچەکان
دەنگی کەلاّن، شلقەیی مەشکەی ژنان	ئەستێرەکان شێتی تەماشای وان
بۆ عەتری بارانی شەوی پێشەوە	ڕەنگی دەرو دەشتی دەرازێنەوە
چاوی خەواڵووی گوڵی سوێسنم	قودرەتی دەستێنێ بچم بێ چنم
یادی جەوانیی و غەم و فیکری ماڵ	شاری قەدیمی دەهێنا نێو خەباڵ
دەنگی دەفە و یاهووی دەروێشەکان	خەڵکی دەرۆیشتن هەتا گومبەزان
حاجی بەڕێ کەن کەبچێ بۆ حەجێ	لاچێ لە ڕێگایی خەراپ و کەچێ
هاوار و یاهووی دەروێش مەشکەڕەش	خەڵکی دەهێناسەری ئەحواڵی گەش
مەشکەڕەشم پیاوی تەماشای‌یە	قەددی چکۆلە سەری قڕژاوی‌یە
ڕەش‌تاڵە پیاوێکی کزو قەدد نەوی	وەختی زیکر زۆر بەئیرادە و قەوی
هاوار و یاهووی ئەوی یا کەر...بم	هەرلەسەری یادە بۆ خەڵکی‌قەدیم
زەنبیل و کەشکۆڵی دوو دەستانی وی	جوانی دەکرد چەل‌چەلە شانانی وی
پێی بوو سەبیلێک کەلەهەرجێی دەدا	عەقرەب و دووپشکی دەهێنا دەرا
کلک و سەری وانی فڕێ هەڵدەدا	باقی دەخوارد عەینی وەکوو لەبلەبا
مەشکەڕەشم ساڵ و ئەیامە نەما	دوای وی دووپشکیش بەسلامەت ژیا
هاتنەوەکەی حاجی کە ساڵێک دەبوو	شاری بۆ پێشوازی و زیارەت دەچوو
زیارەتی حاجی‌یی جەماڵ پاک و جوان	خۆش‌بوو تەماشایی سەفایی ئەوان
وەختێکی حاجی دەگەڕاوە بۆ ماڵ	ڕەفتاری زۆر چا دەبوو بەرعەکسی حاڵ
ڕاست و دروست هاودەمی پیرو هەژار	ڕێی کەج و خواری نەدەگرتن بەکار
ئەمما تەئەسوف دەخۆم ئەرۆکە وا	کوانێ کەسێک شوێنی قەدیمانی ما
حەج تۆبەی ئەکبەرە گیانی بڕا	تۆبەیی ئەسغەر لە ئەوی دوا نەما

## ئاوکێشەکانی سابلاغ (١٥٠)

داشا مەجید هەرکەسە خۆی پێیە چاک     کەس نەبوو بمناسێ کە چووم ژێری خاک
باری گوناهانی جەوانی لەسەر     زیادە لەوەش دەورەبی پیری لەبەر
نەفسی کەسەبیف غافلی کردووم لەخۆ     تاعەت و خێرم نەبوو بۆ خەڵکی خۆ
قەبرە لەدوور ئاوەڵەیە بمگرێ     قوونیبدا رووحی لە دڵ هەڵگرێ
مار و مشک ژێری قەبر هەڵپەرن     کەنگێ کەلاکێکی قەڵەو دێتەکن
جا، وەرە پەروەردەبی کە گیانەکەت     هەر بڵێ خۆم تێرم، نەجیرانەکەت
چەندە ئەیامم دیوە ساڵانی زوو     زاڵمە لێی قەومێ وەکوو جاوی جوو
هەرکەسە بستێنێ لەوی حەققی خۆ     داغی برای، داغی کوڕی، داغی خۆ
«بۆچی کوڕم بۆچی برام مردووە     چەندە گوناهی بوو، ئەوت کوشتووە»
«خوێنخۆری زاڵم وەرە مەیدانی مە     تاکوو لەتوپەتبی بە دەستانی مە»
داشامەجید جێیەتی بیکەم بەیان     ئەحواڵی ئاوکێشی کەرو داشقەکان
هەر ماڵە چالاوی دەنێودا نەبا     ئاوی لە ماڵانی جیرانی دێنا
یادێ لە قاسم و کەرەکە(١٥١) و ئاوهێنان     بەزمی کەری و دەنگی چەلەنگی بڕان
مارف و داشقەی کارەسوولی(١٥٢) فەقیر     ئەسپی فەقیر ژێری سەهوڵێ ئەسیر
کاکە گەلەش(١٥٣) ئاوی دەهێنا لەچۆم     هاوین و زستانێ لە بەستێنو گۆم
چای قاوەخانە هەموو سەر ئاوی وان     ئاوە دەبوو هاتبا لە بەستێنی جوان
یادی بەخێر بێنن. شەوان خەڵکەکان     گۆزە بەدەست شەڕبوو لەسەر ئاوەکان
شەقشەقی گۆزان و سەنڵ، جەررەکان     دەست دەپەرچ نانی ژنان و کچان
گیانە دەخووساوە لەسەر نۆرەناو     گەر بەئەدەب بابەی دەچوو سەر کلاو
شەقەقەیی گۆزانم لەسەر لێوی چۆم     جوانەکچ و دەستەژن و پیریکۆم

جەررە شکاو، گۆزە کە پینە کراو ... بەعزێ لیباس تازە و بەعزێ دڕاو
خاتوونە سێ گۆزەشم[١٥٤] یادی ئەما ... نێوی خەیابانێ لەت و پەت کرا
خات لالەزارێک[١٥٥] بوو لەسەر سەردڕوان ... نانکەر و ئاوکێشی گەلێک ماڵەکان
نێوی ڕەزێ باجی[١٥٦] لەشاری نییە ... کوانێ لەگۆزانی ئەوی بیر هەیە
وەختێ بەهار ئاوی چۆمی بوو قوڕاو ... یەک دوو قەرە قاویان دەنا گۆزە ئاو
تا ئاوە ڕوون بێت و ببێ چایە جوان ... ڕەنگی ئەوی لێڵ نەبێ نێو ئیستیکان
ڕاستی ژیان، بۆچی دەرەنگێنی خۆ؟ ... خەرجی نەبوو ئاوە لەگۆمانی تۆ
چاڵاوە بۆ ڕشتن، چۆمی خوارنەوە ... کەس نەبوو پووڵێ بگرێ بۆئەوە
چاڵاوە هەر زمبەی دەهاتن لەئاو ... ئەورۆ مەژێرە، کە حقوق بوو تەواو
خەڵکی دەلەرزێتن لەترسی ئەوی ... وەختێکی فیشی وی بەدەستی گەبی
فیکرێ دەکا لولەی ئاوی، شکاو ... دەردی لەدڵ چۆنی بدا پووڵی ئاو
چارەیەکی نێ دەبێ تەسلیم ببێ ... پووڵەکە چەند هاتووە بێدا بەوێ
ئێستا لەسەر ئەو هەموو ئەحواڵی وا ... لولەکەشی ئاوی نییە بۆ حەوا
ژینی قەدیم خۆش بوو لەئەورۆ زەمان ... هەرکەسە داغێکی هەیە بۆغەمان
جەرگە کە سووتاوە، هەناوە ڕزیو ... یاخوا بەدوور بێتن بەڵای وا نەدیو
غەم دەچێ نامێنێ، مەبە دڵپەژار ... فەووارە زۆر چێتەسەرێ، دێتە خوار
بەفرە دەچێ ئاخری لەسەحرا و دەر ... فەسلی بەهار دێت و گوڵان دێنە دەر



## کەرێزەکانی سابلاغ[157]

داشامەجید نێو دڵی چەرخی زەمان     پڕ لەپەژارییە لە دەردی گەلان
کەس نەبوو تا ئێستێ، بخوێنێتەوە     بەحسێکی تووولانییە، مێژووی ئەوە
کوانێ لە شەمشێری عەدالەت خەبەر     جەرگی ئەوی دابدڕێ سەربەسەر
مافی دەروونی بۆ سەری کاغەزی     بدرێ بە دەستی قەڵەمی بێ دزی
بابە، خەبەر بێ بەچی جەرگی بڕا     دایکە، بزانێ بۆچی کۆرپەێ نەما
یاکوڕە جوانانی نەدیتوو موراد     چۆنە لە ژێر خاکی ڕەشن بێموراد
ئەو بووکە سوورانی بە تارایەوە     چۆن بوو نەیاندیت شەوی زاوایەوە
بۆچی هەمیشە لە قەدیمی زەمان     تێگرا ئەسیرن کەڵە پیاوی زەمان
یابۆ بە نامردییە هەر تەختی ژین     چاکە ئەسیرە بە چەپۆکی لەعین
داشا مەجید ڕاستی دەئەو فیکرە دام     چەرخە بسووڕێنێ ئیرادەی خودام
تاکوو هەرا هەستێ لە خەڵکی زەمان     زاڵمە لێی قەومێ بە دەستی گەلان
بۆچی سپی و ڕەش دەبێ فەرقی هەبێ     یا سپی ئاغایی ئەوی ڕەش بێ
ڕاستی چ ڕازێکە فەقیر ژێری پێ     وورد دەبێ ئێسکانی بە چەرخانی وێ
چۆنە هەتا ئێستێ کەسێک نەیمراند     چەرخی ئەوا زاڵم کە خەڵکی مراند
یەعنی ئەوە، هێندە قەوییە لە حاڵ     خەڵکی هەموو پێشی دەبەستێ مەتاڵ؟
یا ئەسەری نێ لە وجوودی ئەوی     شەمشێری زەهراوی بە نووکی قەوی!؟
مێروولە گەر زۆر بێ پەلاماری فیل     کوانێ کە خۆ دەگرێ، نەگیرێ بەدیل
عەزم و ئیرادەی دەبێ تێکەڵ بکەین     نووری بۆ سەر تاریکی قووەت بدەین
ئەودەمی ڕێی ژینە بەڕاستی وەیە     ئیلا کە حەیوانە کە ژینی هەیە



کوانێ کەڕێزێکم لەنێو شاریما          وەختێکی ئاوی هەموو شاریان دەدا
ئەووەڵێ بە کێک گەڕەکی ئەرمەنیان          نێوی کەڕێزەی ڕەجەبی[۱۵۸] بوو نیشان
دووەمی لەو لاتری ئەو کووچەدا          نێوی بە چاوشینی[۱۵۹] لەسەر داندرا
یەکی دیکە مەیدانی حاجی‌حەسەن          ئاوی ئەوی لای هەموو عالەم پەسەن
نێوی کەڕێزەی‌بوو، کەڕێزەی‌مەلای[۱۶۰]          جێگەی لە گۆشێک‌بوو لە مەیدان جێگای
دوایە کە هاتینەوە سەر سەرڕەوان          یەک بوو لەوی ماڵە خەجیجی شێرخان[۱۶۱]
سەر لێوی هەورازی یەکی دیکە بوو          نێوی کەڕێزەی سەری هەورازی[۱۶۲] بوو
یەکی دیکە نێو ماڵی کاکە غەفوور[۱۶۳]          شوورەتی گەل شێعری ئەمن نایە جوور
یەکی دیکە پێش ماڵە خات گۆزەڵێ[۱۶۴]          دایکی سەلاحزادە بوو وای پێ بڵێ
ئاخری دەنێو ماڵی بەڕێز کاک عەلی[۱۶۵]          کاک عەلی ئاسنگەر و ئاغا نێوی
لای گەڕەکی سەرخڕێ چەن دانە بوو          زیندەگی ئەو خەڵکە بە ئەو ئاوە بوو
ئەووەڵی پێش ماڵە عەلی‌کاکە ڕەش          ئاوی وەکوو چاوانی قڕژاڵی گەش
خوارتر لەوی بوو کەڕێزەی سەید مەلا          گۆشەی کووچەی بوو ئەسەر لێی نەما
نێو ماڵە فەرهادان کەڕێزەی لە نێو          یادی نەماوە لە بنی دارە سێو
نێو گەڕەکی شوانان یەکی دیکە بوو          پێش ماڵە سەفیاریش لە گۆشێک هەبوو
کووچەیی شەوقی کەڕێزەی پینەچیان          ئەورۆ لەوی کوانێ ئەسەر کوا نیشان
نیو کووچەیی مازوان کەڕێزێکی قووڵ          نێوی کەڕێزەیی ئەوێ میرزا ڕەسووڵ
زۆر بوو کەڕێزانی دیکە نێو حەسار          ئێستێ سەریان پاکی گیراوە بەجار
باوونە جێی فێنکی کووپانی پەنیر          یا لە بنی بەردی ڕەمانن، ئەسیر



## حەمامەکانی سابلاغ[١٦٦]

پووتی و میرزارەسوول جێی جننەکان — قوولْ و لەبن عەرزی هەموو جێ و مەکان
وای دەکوت بەعزێکی، کە حەمامی سوێر — پڕپڕە جندۆکە، شەوانە، بەزۆر
نێوی شوجاع‌ئەلملک بوو ئەو حەمام — هیچی نەماوە ئەسەری بۆ، کەلام
نمرەیی پووتی کە دوو سێ نمرە بوو — تاریک و قوولْ و لەپەنا پووتی بوو
کوانێ عەباس‌ئاغا[١٦٧] حەمامی نەما — ئاوەکەی سێلاوێ ریشەی دەر هێنا
وەختێکی چایخانەی عەلاو تێک درا — حەمامی مەڕمەڕ لە جێگای ساز کرا
ئەمما قەراری نەبوو حەمامی وا — ئەورۆکە پاساژ بە نێوی سینا
حەمامی حاجی مەتلیب ساز کە بوو — هیچ وەکوو پووتی و ڕەسوولی نەبوو
نەیبوو لەنێو، تیان و خەزێنەی حەمام — شێرە بوو جێی تیانی دەگەڵ سەتڵەکان
پاشی ئەیامانی درەنگ ساز کرا — نمرەیی حەمامی شێر و خورشیدا
کوانێ لە حەمام و لەتیانی خەبەر — کوا لە حەجامەت‌کێشی[١٦٨] ماوە ئەسەر
کوانێ وەسائەژدەر[١٦٩]، لە حەمامێ کوا؟ — دەستنی بە تیغ وکەڵەشاخێوە با
ڕەحمانەکەش[١٧٠] جێی وەکوو وی خاڵی‌یە — کاکەدەروێش مستەفا[١٧١] بن عەرزییە
یادی‌لە ئاوگیری، سمایل‌و ڕەسوڵ[١٧٢] — حەمامە چەن خۆش بوولەبن عەرزی‌قوولْ



## ﴾ تەکێەی بابە خەڵیفە[۱۷۳] ﴿

داشامەجید وەختێ بەفر دێتە خوار  هەورە ڕەشە تەرسی دەکا بەرقەرار
سەرما و لەرزینی ئەوی بۆ فەقیر  منداڵی بێچارە لە ماڵێ ئەسیر
بان و سەری‌دەشت و حەساران و کێو  زاڵمە داییدەگرێ هەموو جێ لەئەو
بەفرە، کە چوون عەرزی هەموو گرتووە  فوونی پەرەندانی حەوای سردووە
هەرکەسە جووڕێکی لەدڵ ماتەمە  گەرچی بەفر عومری لەشاری کەمە
داخی گران ئەورۆ ئەوە سەر وولات  دار و درەخت و گوڵ و گیا و نەبات
گەرچی بەزاهیر هەموو یەك ڕەنگی‌یە  زەرد و گوڵی، سوور و بنەوش، زێری‌یە
ئەمماکە زۆر گرتی جێگا، بەوری‌وا  خەڵکی دەکا چارەیی دەرد و دەوا
وەر وەرە و بێڵە بەپیاوی قۆچاغ  دێتەوە سەر شانی لەنێو شار و باغ
بەفری وەها هەڵ دەسوورێنن بەقەو  تێکی‌دەدەن قودرەت و قووەت لەئەو
بان و وولاتی هەموو خاوێن دەکەن  بەفرە لەهەر جێ‌یە کە بێ دەردەکەن
وەختێکی خڕبووە خەڵك پێش‌ئەوی  شۆقی هەتاو عومری دەکاتن نەوی
بەفرە دەبێ ئاو بە عەرزدا دەچێ  تەنێ دەبێ فەوری لەوێ جێ‌بەجێ
ئیدی نەکا زوڵمی ئەوا دوای ئەوە  حاڵی‌بێ ڕۆژە لەدوای هەر شەوە
تەجرەبەیە، گیان و عەزیزانی من  دەرد و پەژاریی ژیان حەل دەبن
بەفرە، کەچوو سەوزە لەجێی بەرقەرار  خۆشە، بەخێر بێتەوە مانگی بەهار
شللێر و شەش‌پەر هەموو تارا لەسەر  دەشت و دەرو باغە پڕە سەربەسەر
بولبولە سەر شاخی گوڵانە ئەلان  یادی گوڵانی کەبە بەفری نەمان
حەیفە نەیان دیتەوە فەسلی بەهار  شادی و خۆشحاڵی بکەن بەرقەرار
ئەمما هەمیشە گوڵە شللێرەکان  بۆنی ئەوان دێننەوە سەر یادەکان
مانگی بەهار دێنەوە. گیانی عەزیز  تەجرەبەیی پیری، ئەوا دێتە ڕێز

ئەودەمی یادێک لەغەمانی قەدیم نامێنی نێوگیان و دڵانی سەلیم
جا، گوڵەخاشخاشکە لە سەحرا و دەر دەستی وەنەوشەی دەگرێ بۆ سەفەر
خۆش سەفەرێک بۆسەری کێوان و دەشت شار و وولاتانم دەبێتە بەهەشت
هیچ ئەسەری دەرد و غەمان نیێ لەنێو پیاوە فەقیرانی زەعیف دەبنە دێو
قودرەتێ پەیدا دەبێ نێوی گەڵی هەرکەسە ئاواتی بەجوورێ دەڵێ
ئەو دەمی، چوون شیدەتی سەرما دەچێ ڕوورەشی بۆکاکە ڕەژێکەی دەبێ
ڕوورەشی بۆ کاکەڕەژی تا ئەبەد فەسلی هەموو ساڵێ هەیە تا لەحەد



ئاوی تەکیەی بابەخەلیفەی بەڕێز یادی نییە پێشی ڕەفیقی عەزیز
ئاوێکی زۆر سارد و تووڕمپای لەسەر ڕوون بوو وەکوو چاوانی قڕاژڵی هەر
بەفر و سەهۆڵی نەدەویست ئاوی وا کێ بوو کە بەخچاڵی لە ماڵێ هەبا؟
ئێستێ کەسێک نێوی ئەوی نایەبیر چونکی هەموو دەستی غەمانێ ئەسیر
ئاوە نەما، نێوی ئەمەش عەینی وی وون دەبێ نێومان لەخەیاڵی قەوی
دەنگی تووڕمپای تەکیەم دێتە گوێ چاکە لەدونیایە چلۆن وون دەبێ
خوارەوەکەی شاری لەسەر ئاوی وی ڕۆژ و شەوان، وەختی بەیانان و دی
جوانە جحێلانی سەری ڕێی ئەوی فێنکە ئێواران و بەیانی و شەوی
بۆ سەری ڕێی ئاوێ لیباسانی جوان کیژە بەری دابوو لەئەنواعی وان
خەل خلە و مێخەک و ریحانی گوێ بەرموور و بازنان و دەپاوانی پێ
چاوانی پڕکل بوو دەسانی خەنە جوانی قەدیم ئێستێ لەشاری کەمە
هەرکەسە دۆستێکی هەبوو سەر ڕێگا ڕێی تەکیە چەند خۆش بوو وەکوو سینەما
ئێستێ، هەرچەند جارێکی دەچمە ئەوێ یادی قەدیم دێتەوە بیرم لەوێ
عومرە چلۆن دێتو دەکاتن گووزەر داخوا ئەمەش کەنگی دەچین بۆ سەفەر
لەو سەفەرە ماڵە خەو نابینەوە خۆشە لەکۆڵ دەرد و غەمان بوونەوە
هەرکەسە ئازۆقەی دەگەڵ بێ، سەفەر ڕاحەت و ئاسوودە دەکاتن گوزەر
باخوا بەخۆشی سەفەر و بێتە پێش لەو سەفەرە، نەوبێ غەم و دەردو ئێش

# سەرچاوە(١٧٤)

ئاوەکەی سەرچاوە چ خۆش بوو شەوان    پیاو و کوڕ و کچ دەچوو بۆ ئاو هێنان
جێگەیی سەرچاوە لەشاری ئەلان    بۆتە بەمەیدان و خەیابانی جوان
ئیستگەیی ڕادیو لە نیزیکی وی    خامۆشە سەرچاوە نەما نێوی وی
سەرچاوەکە بەزمی هەبوو جۆربەجۆر    جوانە جحێلان، لەسەری ڕێی بەزۆر
سەتڵ و گۆزە و جەڕە بە دەستی کچان    زۆری بەقەمنی بوو لەسەر ئاوەکان
کاکە لەسەر ڕێیە دەوەستا لەوێ    تاکوو دوو چاوی بە حەزی خۆی کەوێ
ڕوخساری نێو پرچی کچانی کەژاڵ    عەینی وەکوو مانگێ لەئاسمانی شار
دەسماڵی بەگوڵینگی سەری چەندە جوان    ماڵی وێرانم کەنەماون لەوان
چ بڵێم لە سەرچاوە شەو و نیوەشەو    زەمبەی ئاوی لێ دەهاتن بەقەو
بەسە، دەسووتێنێ هەناو، یادی وێ    هەرچی بنوسم غەمی دی دێتە جێ
واچاکە بێدەنگ‌بم لەشەرحی ئەوی    تاکوو نەسووتاوە دڵانی قەوی
یادی ئەوی نێو دڵی خەڵکی فەدیم    شۆقی چرای ڕوونە لەشاری کەدیم
چەند بەلەزەت ئاوانی جەرڕانی وێ    سارد و سەهۆڵی نەدەویستن شەوێ
ئێستا، کە لوولەکەشی ئاوی نییە    گۆزە بەدەست، خەڵکی بەدووی ئاوییە
یادی ئەوێ دێتەوە بیرم لەشار    خۆشە فەرامۆشی نەبێ یادی یار
ئەو یارە زۆر خزمەتی بەو شارە کرد    ڕۆژ و شەوێ خوڕڕەی دەهاتن بەگوڕد
نێوە شەوان خوڕڕەیی نێو دەشتەدا    لای‌لایی بۆ خەڵکی گەڕەک هەڵدەدا
ئێستێ کە هەر ماوە وەلی بێ‌نیشان    جێی وی لە مەیدانە لەبن خاکی جوان
هەر بەوەفا ماوە لەبن عەرزەدا    لولەکەشی کردو خەڵک، بێوەفا

## پلووسکی سه‌ید بابه‌سوور[175]

ئاوی پلووسکێ که‌نه‌ماوه ئه‌لان     کێیه بکا یادی نه‌ماوان به‌گیان
ئاوێکی زۆر ڕوونی هه‌بوو وه‌ک بلوور     نێوی پلووسکی بوو سه‌ید بابه‌سوور
جێگه‌یی ئه‌و گه‌رچی نه‌ماوه، به‌ڵام     نێزیکی مزگه‌وتی به‌ڕێز سه‌یدنیزام
مزگه‌وتی سه‌ید بابه‌سووری سه‌یدنیزام     زۆری هه‌بوو پیر و مورید و غولام
ئێستێ له‌وێ شه‌قه‌یی گوزانه نێ     کێیه له‌وێ قاپی بشواتن شه‌وێ
به‌زمی پلووسکێش وه‌کوو سه‌ر ئاوه‌کان     لێی بوو کچۆڵان و جحێڵانی جوان
جێگه‌یه‌کی خۆش، بۆ جحێڵانی شار     هه‌رکه‌سه دۆستێکی ده‌گرت بۆ قه‌رار
وه‌ختی ئێواران، لاله‌زاری قه‌دیم     عه‌بنی پلووسکێ بوو له شاری که دیم
کیژه ده‌برازانده‌وه خۆی بۆ سه‌ر ئاو     جه‌رره به ده‌ستێوه بنێ سه‌ر کڵاو
ده‌سره‌ێ گوڵینگ‌داری براێ تازه‌لاو     پێشقه‌دی پشتێندی ده‌دیترا به‌چاو
تێکچوو پلووسکه به خه‌یابانی شار     چی‌دی نه‌ما به‌زمی له‌سه‌ر ئه‌و قه‌رار
ته‌جره‌به‌یه ئه‌و هه‌موو تێک چوونی وا     هه‌ر ڕۆژه دونیا ڕوو ده‌یه‌کێ ده‌کا
ڕۆژێ ئه‌تۆ، ڕۆژێ ئه‌من، ڕۆژی دی     جه‌معی هه‌موو لایه ده‌با بن‌گڵی
به‌زمی ژیانی هه‌موو که‌س تێک‌ده‌چێ     باشه له‌ئێستێوه بکه‌ین فیکری وێ
تێک‌چوو پلووسکه‌ش به‌هه‌موو به‌زمه‌وه     کێیه ئه‌به‌د بێ، له‌سه‌ری ته‌خته‌وه
ته‌خته، که ڕه‌نگینه به‌سه‌د ڕه‌نگی وا     پێی له‌سه‌ری چه‌رخه‌که نێتی به‌قا
کوانێ هه‌مبشه نه‌فه‌رێک سواره له‌و     هه‌ر ڕۆژه یه‌کێکی ده‌بینی سه‌رئه‌و
به‌سه عه‌زیزم تۆ غه‌می بۆ مه‌خۆ     هاتۆته له‌نگه‌ر که بکا بابه‌ڕۆ
ئه‌وده‌می هه‌رچی ده‌دڵت دایه حه‌ق     بستێنه تۆڵه‌ی خۆ له زاڵم به‌شه‌ق
ڕۆژی سه‌فا ئه‌وده‌مه‌یه کاکه‌گیان     وا ده‌ڵێن: «مانگاکه که‌مرد دۆ بڕان»

وەختێکی مانگایەکە مرد، دۆبڕان — چەرخی زەمان دەوری دەبێ وەک چەلان
کێیە لەوی گیانە، نەی ئێشابێ دڵ — یانە لەدەستی، نەچووبێت سوورەگوڵ
چەرخەکە نەیناسی وەفا وجەفا — چاک و خەراپی هەموو ژێر پێیە نا
پشتی هەزار جوانی گوڵاڵی شکاند — زۆری لەکن دایک، منالی فڕاند
تازە لەکوێ فەسڵی بەهار دێنێ گوڵ — دایە لەئامێزی دەکا سوورەگوڵ
یا لەکوێ ئاوونگی دوو چاوانی وی — ویشکی دەکا شۆقی هەتاوی قەوی
چەرخە هەتا ئاوا بباریێنێ ئاو — ئاوی هەبەکانی دوو چاوان و چاو
جا مەگەر، کاک ئێنە شەماڵ بێنەلا — هەوری ڕەش و بەفرە، لەسەر لاببا





دیوانە مەشکەرەش و دەرویشەکانی سابلاغی.

## ﴾ سەلاکەرەکانی سابلاغ[١٧٦] ﴿

داشامەجید یادی جەوانیت بەخێر — خەڵکی قەدیمی لەتەرێت بۆتە تێر[١٧٧]
وا دەڵێ دایکم لە زبان بابی من — زۆری تەرێ خواردوو لە تۆ شاخی من
نێوی سینەی تۆ هەموو جەنگەڵ بووە — ئەمما ئەمن باسی تەرێم بیستووە
ئاخ وسەد ئامان براگیانەکان — عومری بەشەر بەفرە لەپێش تاوەکان
گەردیشی دونیایە بەرەو فانی‌یە — عومری ئەمە بەفری لەسەرکانی‌یە
ڕووتە منالّ هاتینەوە نێو ژیان — ئێمە دەگریاین و قەوم شادمان
کارێ بکەین دۆستی بەڕێز لاوەکان — ئێمە بە خۆشحالّی بڕۆین گەل غەمان
بۆچی نەڵێن حەیفە، نەماوە فلان — ڕەحمەتی حەققی لەسەری بێ شەوان
ڕەفتاری چەند چابوو دەگەڵ عالەمێ — چەندە بە ڕۆیشتنی کەوتنە غەمێ
مانگی ڕەمەزانێ چ خۆش بوو گوزەر — خەڵکی هەتا وەختی سەلا بوون لەدەر
دەنگی سەلای پارشەوی مەللاعەلی[١٧٨] — خۆشی دەکرد فەقێ خەلیل[١٧٩] دەنگی وی
یادی بەخێر حاجی ڕەحیم[١٨٠] سەلاکەر — نوێژی هەموو جومعە سەلای بوو لەسەر
یادی سەلای سۆفی حەسەن[١٨١] چۆن نەکەم — دەنگی غەریبی شەو و ئێوارەکەم
مەللا موحەمەد[١٨٢] بوو لەمزگەوتی خوار — دەنگی سەلای هاتە گوێ، ئەولای شار
کاکە غەفوور[١٨٣] بشم لە مزگەوتی سوور — دەنگی سەلا و شێعری نەماوە لە ژوور
وەختێکی عالەم هەموو کەوتۆتە خەو — کێ وەخەبەر دێنێ، کەتاریکە شەو
بێ‌خەبەری و خامۆشی‌یە سەر وولات — کەس نێ کە فیکرێکی بکا بۆ نەجات
پارشەوە دەنگێک لەکەسێ نایە گوێ — تاکوو خەڵک هەستێ و هاواری بێ
بەعزێ کە ئەهلی خەون ماتن لەجێ — زۆر کەسە مایڵ بە هەڵستانی نێ
عەبددیەکەی تاڵبی هەستان هەر — ڕەسمی خۆ دەبزانی چلۆن سێتەدەر

ئەمما جەوانانی نە ئەهلی خەون — چاویان لە گەورانە هەتا دووی کەون
داخە ... لە گەورانە کەسی وانەما — تاکوو هەراکاتن بەبانگ و سەلا
«هەستە مەنوو، وەختی خەوی نیٚ عەزیز» — «خەلکی بە تیکرایی هەموو بۆتە ریز»
«نووستە نەفعیکی نی یە گیانی من — دوا دەکەوین ئیمە لەخەلک و ئەوین»
«تا شەوە تاریکە لەتۆم وا دەوی — وەختیکی روونا کە لەتۆم ناهەوی»
«دەستی بدە دەستم و پشتمان بەیەک — ئەمن و ئەتۆ پیشقەدەم و ریک و پیک»
«پارشەوە هەستین و هەرایە بکەین — خەلکی کە هەستانەوە شایە بکەین»
«ئەو دەمی عالەم دەکەویتە سەفا — خۆشی کەهات نارەحەتی لادەبا»





قوبی مەولەوی یەکیک لە سیرانگاکانی سابلاغ. ئیستا جیگای وی سەدی مەهابادی یە.

## مەلاکانی سابلاغ[١٨٤]

یـــادی مـــەلای پـــیری زەمـــانانی زوو سـیدقی و شـێخقادر و مـەجدی هـەبوو
ئـــیدی لە مـــزگەوتی بـــەڕێز بـــابەسوور مـەللا ڕەشـە پـیاوێکی کـاری و سـەبوور
یـــادی مـــەلا خـــالید و بـــزنانی وی پـیاوی مـوسڵمانی ئـەوام کـەم دەدی
ڕەبـــبی خـــودا، نـــووری بـــڕێژی سـەری خـۆم لە ئـەوانـەم کـە دەبـم نـۆکـەری





باغی شیرخورشید کە ئێستا کوچەی هشت میتری و شەقامی وەفاییە.

## « قاتی و قڕی سابلاغ(۱۸۵) »

داشامەجید وەختێ کە تاریکە شەو — مانگە لە پشت تۆیە خەبەر نێ لەئەو
عالەمی شاری هەموو یەک ڕەنگە، ڕەش — زەرد و سپی وکەسک، گوڵی و سوور و ڕەش
خامۆشی و ماتەمە سەر خەڵکەکان — دێ کزەی بای قۆرغی، لەسەر بانەکان
دەنگی مناڵێکی نەخۆش دێ لە دوور — پێی نەکرا دوکتور و دەرمانی جوور
داێکە بە گریانە «سەغیرە کوڕم» — «مردنی وی ئاوری دا نێو دلم»
دەنگێکی دیکە لە وەست شارەوە — قاقا، لەسەر قاقا دەدا پێکەوە
کەس لەغەم و دەردی کەسی نێ خەبەر — ئەو شەوی تاریکە چلۆن دێ بەسەر
کوانێ قەدیم حاڵەتی ئاوا هەبوو — خەڵکی بە دەرد و غەمی یەک ماندوو بوو
غەرقی غەم و ماتەم و دەردم دەکا — بەچکە فەقیرێکی نەخۆش بێ دەوا
دێمەوە سەر بەحسی غەم و دەردی خۆم — باشە کە بۆ دەردی ئەوی غەم بخۆم
هاتەوە وەختێکی کە قاتی و قڕی — هەشتەرۆ نێو شاری بە گەڵ هەڵقوڵی
وەزعێکی زۆر نارەحەتی بوو لەشار — خەڵکی هەموو دڵ بەغەم و لێو بەبار
دێتەوە بیرم کە لەنێو خەڵکەکان — گۆشتی کەڕ و ئەسپی لەبرسان خوران
پڕ بوو لەنێو شاری هەموو هەشتەرۆ — تێکرا هەموو سواڵی دەکرد کۆ بەکۆ
یادی لە کوللێرەی ڕەوایی بکەم — چاکە بۆزانینێ کە بەحسی دەکەم
نیوە هەویر سەنگەکی شاتر عەباس — فەرقی نەبوو سەنگەکی وی گەڵ پەلاس
وەخت و زەمانێکی کە نان بوو گران — جەمعی خەڵک وەختی بەیانە و شەوان
باب و کوڕ و کچ نێوەشەو هەڵوەدا — کەوتنەوە دوای نانی بەدوای نۆبەدا
سۆمی ڕەوابی بە چزەحەمەت دەهات — دەستی خەڵک یا خوا نەبینێ وولات
یەک دوو سۆمی عەینی وەکوو بەردەپێ — جا ئەتۆ ئەی گیانە قیاست هەبێ

کشمیش و خورما لەجێگای قەندی جوان
چایی دەخوارد، خەڵکی لەشاری بەوان

جەمعی لیباسی خەڵک هەرجاوی شین
نەی‌بوو بەجووز عیددەیەکی خۆش نشین

چیتی کریشەکە هەبوو، زۆر گران
عیددەیەکی کەم بوو کە بکڕێ لەوان

کۆپێنی چا و قەند و شتان سازکرا
خەڵکی بەدوایدا دەبوونە هەڵوەدا

هەرکەسە جوورێک بەغەم و دەردەوە
ژینی بە بەد بەختی دەبرد پێشەوە

ئەمما خوداکردی نەبوو عومرە زۆر
قاتی و قڕی دەر چوو لەسەر شارەبۆر

دوایە سەفا کەوتەوە نێوی وولات
تاریکە شەو لاچوو کەوت رۆژهەڵات





باغی سیسە دە سالی ١٣٨دا.

# پێستانەکانی چۆمی (١٨٦)

داشا مەجید وەختێ کە کیژێکی چووک
جێژنە لەبەرەتی لیباسانی بووک

دەسنی خەنە بەستۆ شەوی پێش لەوی
تاکوو دەگەڵ تازەکەوش رێک کەوی

پۆز و ئیفادەی سەر و دەسماڵی جوان
هەڵدەخولێ لەو سەر و ئەولای بان

پوولی بەدەست جێژنە و جێژنانەیە
دەکڕێ شتانێکی گران مایەیە

پێشی ئەوی بەچکە فەقیری سەغیر
پینە لیباسیو دڕاو کەوشی جیر

شەرم و حەیا ئارەقەیی سەر ملی
ڕێی ئەبەدەن نادا بکا هەڵپەری

چەندە لە دڵخۆشە کەسانی سەروو
چاوی لەجیرانی بێ گەر جێژنە بوو

تاکوو بڕازێتەوە جیرانی وی
بەک غەم و بەک ڕەنگە لیباسی ببی

جێژنە ئەوێ ڕۆژە نەرۆژانی دی
تێکرا گەڕەک غەرقی دەخۆشحاڵی بی



لەو شێرو خورشیدەوە تا چوارچرا
جەمعی هەموو نەردە بوو پایەی جودا

مەنزەرەیی دەورەبی نەردانی چۆم
باقۆ چزۆر سەرگۆمی قازیی خۆم

بەزمی مەلە و بینە کێشانی مناڵ
شیرینی دەکرد لەززەتی هەرکاری تاڵ

قەرنە گۆمە دیتن لەپشت نەردەوە
عەبنی تلبویزیون، تەماشای ئەوە

تێک چوو نەما نەردە و دیواری چۆم
ئێستێ ئەوێ پارکە کەبۆ لای بڕۆم

ڕۆژە عەزیزانم دەبێ بگوزەرێ
دوای مە، شتی دیکە دەکەونە دەرێ



دێــــتەوە بــیرم کـــە هـــەموو هـــاوینان
بــــێستانی بـــــتێنێ دەگـــەڵ قـــاوەخان
تـــاکـــوو تـــرێزوو و خـــەیار هـــاتەدەر
نـــێوی نـــەبیلان[١٨٧] و تـــرێزووی لەســـەر
کـالیاری[١٨٨]گـەورە و بـەمەزە و تـرش و خـۆش
فـــەدی بـــەقەد تـــازە جـەوانـێکی خـۆش
یـــادێ لەبـــێستانی قـــەراغـــانی چـــۆم
یـــادێ لە کـاک سـالح[١٨٩] و نـازداری خـۆم
خـــوار و ســـەری پـردێ هـەموو بـاغچەبوو
ســـەبزی و هـــاروێ و تـــرێزووی هـــەبوو
یادێ لە نـازدار[١٩٠] و حـوسین[١٩١] تـوورەکـەی
ســـالح و رەحـــمانە ســـووتاوکـوولەکـەی
عـەبدوڵلای سـەبزیچی[١٩٢] و حـاجی رەشـید[١٩٣]
گـــێزەر و تـــوور و کـــەلەمیان هـــەرێژید
یـــادێ لە کـــاحوسینە پـــەزەی[١٩٤] خـــڕکەڵە
ســـــاحەبی بـــــێستانی زبـــان فـــرفرە
مـــوودەیە ئـەو شـوانـی مـەری شـاری بـوو
دوایـــە بـــەچێوداری هـــەرای بـــوو لە دوو
ســـەبزی کـــا قـوربانی فـەرامـۆش نـەکـەی
گـــێزەر و تـــوور و کـــەلەم و کـــوولەکـەی
کـــاک ســـاڵە شتمـــەخمەرە بـێستانی کـوا
ئـــەورۆ لەبـــن خـــاکـــەکـە یـادی نـەما



## «باغچە و بێستانی میرزا موستەفا»

داشــــــامەجید یـــادی فـــەدیم هـــاتەبیر
وردە مـــــناڵێکی بـــەدەست غـــەم ئـــەسیر
نـــەم بـــوو لەســەر شـانی نـیبێی بـابیچاک
چـــونکی فـــەبرکـــردی حـــیسابانی پـــاک
دامـــــێنی دایکـــــێکی فـــەقیر مـــەنزڵم
دەرد و غـــــەم و کـــوێرەوەری مـــوشکیلم
جــێژنە نـــەبوو تـــازە لیـــباسێکی جـــوان
کـــەوشە نـــەبوو دایـــە غـــەرق حـــەسرەتان
دەربـــەدەری بـــوو بـــەشی ئـەو جـاریمن
بـــابە بـــەجێی هـــێشتم بـــە پـێنج ساڵی سین
دەردەکـــە یـــەکبـــوو، بـــە دووسـەدبوو بـەجار
قـــاتی و قـــڕی هـــاتەوە ســـۆراغـی شـار
رەقـــــفەکـــولێرانـــێکی هـــەرزن لەمـــاڵ
دایـــــە دەیـــــهێناوە لە جـــیرانـــی خـــوار
هـەرچـی هـەبوو سـەروەتی نـێو مـاڵی بـاب
جـــەمعی بـــڕی قـــاتی و قـــڕی مـاڵ خـەراب
ئـــاخری کـــە ئـــەو قـــاتی لە شـاری نـەما
هـــەوری رەشـــی ژیـــنە لەســـەرمان نـەما

وەردە سەغیری و فەقیری بڕا — ڕەحمەتی مەولا بەسەرمدا ڕژا
زۆرم لە شاری دیوە من دەوڵەمەند — ئاخری عومری بەفەقیرێوە بەند
غەیرە ئەویش زۆرم فەقیر دی لەشار — ئاخری عومر پوولی هەبوو زۆر هەزار
وایە وەفا و عەهدی فەلەک وادەڵێ — هەردەم و وەختێک بەکەسێک هەڵدەڵێ
عومرە چناخوش و چخۆشبێ دەروا — ئەسلی خودایە و بەقییەی نارەوا



کوانێ هەیە، بەحسی لەیادو نەما — باغچە و بێستانی میرزا موستەفا[195]
گوڵی نەما، باغی نەماوە ئەلان — کێ دەگرێ ئەورۆ لەوانە نیشان
چەندە میوە و کاهووم لەوێ خواردووە — ئێستا هەموو ماڵ و کۆنە خانووە
شەرقی خڕێ و خواری حەمام مەولەوی — جێگەیی ئەو باغەیە گەر رێتکەوی
مەغریبی ئەو چاکی مەلاجامی‌یە — باغێکی قەبسی هەبوو هەڵوێنییە
باغچەیی میرزا رەسوولی[196] نێوی بوو — ساحەبی ئەسڵی‌وی کەسێکی‌دی بوو
ساحەبەکەی نێوی هەبوو پینەچیان — پیاوێکی زۆر ئاغا، نەماوە ئەلان
جێی ئەوی خانوو و دوکان سینەما — باغی میرزا موستەفا نێوی نەما
پێشەوەی، کاراژی عەرووسان کرا — وەختێکی، مەدرەسە لەوێ داندرا
چەرخە، زەمانە، بەهەموو نەوعی وا — هەر ڕۆژە جوورێک بەخەڵک روودەدا
حەیفە کە رووی داوە چەرخ بێ‌ووچان — دایناوی سەرتەختی بڵێندی زەمان
هەرخو ببینی و بکەی سەرکوتان — موحکەمی کەی پایەیی ژێر تەختی جوان
هەورە کە وەختێکی ببارێنێ ئاو — تێکی‌دەدا سەرووەت و ماڵ و پلاو
ئەو دەمی حەسرەت ئەسەری نێ برا — کەوتی دەژێر پێدا هەزارە بەلا
زۆرم لەتەخت دیتووە هاتوتەخوار — قودرەتی لاچوتن بەدەستی هەژار
کوانێ دەبێ بکرێ خیلافی قەزا — چەرخە ئەگەر سووری بداتن دەدا
بۆیەکە سەر تەختی، سەفا لازمە — نەک بکەوتی، نەفسی لەعەین زالمە
خۆت لێ‌نەگۆڕێ کەبرێک بووی قەوی — چەرخە هەزارانی قەوی کرد نەوی

داخمە وەختێکی دەبینم ئەوا ئێ سەروو، ئێ خوارێ وەژێر پێدەدا
بۆچی کە پللیک چوو، سەری نێردیوان هیچی وەبیر نایە قەدیمی زەمان
هەر وەدەزانێ، عومر ئەو ڕۆژەیە بێ‌خەبەرە، مەستە، ئەوە نۆرەیە
خۆشە ئەگەر جێگە گەیشتە حەوا شۆقی بدەی عەینی شەمێ بۆ سەفا
نووری شەمێ تاریکە شەو لازمە وەختێکی ڕۆژ ڕوونە خەڵک ئاسنە
ئاسنە، دەشکێنێ قەلایی زەمان گوللەیە، دەپسێنێ رەگی ژینی وان





عەکسیک لە قەبری پیرەژنی دە سالی ٢٨دا.

## باغی میللەت[١٩٧]

باغەکەی میللەت کە نەما چی دیبە — جێی ئەوی مەیدانی مەلاجامی یە
شارە لەدووری بوو ئەویش دوورلەوی — حەوزو فەوارانی، چجوان هەڵقوڵی
وەختێکی تەپێکی بڵیند ونەوی — مردوو لەژێر خاکی قەبر بوو نەوی
مووەدەتێ فەرمانداری شاری کرا — دوایە ئەساسی لە بناغە نەما
کردی وەرەهرامە بە پارکێکی جوان — ئێستێ کە مەیدانە و خەیابانمان
ڕەنگی چرای سوورو بنەوشی ئەوێ — بیری گوڵ و شەوقی چەلان دێننە جێ
ئەوگوڵە باغانی لەوێ سوور دەچن — هەریەکە روخساری گوڵی روویەکن
ڕۆژێکی گەرمات، و ئەوی دی گەشن — حەیفە لەئەو بەزمی گوڵە بێ بەشن
گردی بڵیندیشی هەموو بوو نەوی — کەس نیێ کەیادێکی بکاتن لەوی
کوانێ کەرێزەی سەری گردی چکۆڵ — ئاوێ بدا دەوری بکاتن بە گوڵ
یا حەمە گەشتێکە،[١٩٨] بە ئاوپاشەوە — ئاوی بداتن بە گوڵی باغەوە
دەورو بەری ئەورۆ تەماشا بکە — خەڵکی لەکاری خۆ چلۆن زیرەکە
ئێستێ هەزار کاکە حەمە ئاو دەدا — ئاوپاشی نەیماوە دەگۆزەی دەکا[١٩٩]
ئەمما بەسەد ئاوە، نەبوو سوورەگوڵ — زەرد و زەعیف بزتن کەلایانی چڵ
داخە و سەد حەیفە ژیانی قەلە — بگری سەری پیرە هەڵۆ زەلزەلە
فەووارە ئاوانم بپرژێنە ئاو — بپرژێنە فرمێسکی لە ژینی گڵاو
ژینە خەلاس باغی ژیان تێکدرا — چاکە منیش خەتمی بدەم ماجەرا

# مەکتەب و مامۆستاکانی سابلاغ[200]

داشامەجید وەختێ کە نووکی قەڵەم / هەڵپەڕین و شادی دەکا زۆر و کەم
هەردەمە نەقشێکی لەسەر ڕێ بەتی / ناجی لەسەر، یانە لەبەر پێ بەتی
وەختێ بەهارێ بۆ خەڵک ساز دەکا / یەک دەمێ گریان و پەژارێ دەکا
ڕۆژێکی زۆر خوێنی دەڕێژێ لەخۆ / وەختێکی نێو سوڵح و سەفایە بەڕۆ
گا، دەبێتە زاڵم و خوێنخۆر و دژ / گا، دەبێتە قاتڵ و ئینسانەکوژ
چەندە موقامی قەڵەمی گەورەیە / نون و قەڵەم شاهیدی ئەو کارەیە
حەیفە قەڵەم هەر لەسەفایە نەبێ / خدمەتی ئینسانی لەکایە نەبێ
نەستێنێ تۆڵەی هەموو مەزلومەکان / لەو هەموو زاڵمانی دەگەورەی زەمان
یابەعەین شێری نەکا لەت بەلەت / پشتی هەموو زاڵمی بەدزاتە لەت
دەردی نەبا نێوی دڵی دای و باب / بۆ کوڕی کوژراوی، لەبن ژێری خاک
یا نەبێتە گوللەی گەرم و بەتین / بڕێ دڵ و گیانی بوتانی لەعین
بۆچی هەرای بەرزو بڵیندی نەبێ / هاواری ڕزگاری ئەسیری نەبێ
کوانێ قەڵەم جێی لەبنی چەرخییە / یانە ئەسیری پەت و زنجیرییە
داخە...! بەدەستانی کەسانی خەراپ / ئاوێ لەکانیاوێ بکاتە سەراب
بڕێ ڕیشەی داری ئەوین و موراد / خەڵکی لە بێزاری ببێ بێسەواد
ئەورۆ قەڵەم خەڵکی لەتۆ دڵبەرۆ / کەوتوویە دەستانی کەسی سەربەخۆ
کوانێ دەتوانێ لە حەوا هەڵفڕێ / تەیری دڵت باڵێ بدا بۆ گەلێ
بولبولی دەنگت لەسەری دارە مرد / داخی گرانم لەتۆ ڕووخاوە پرد
وایە عەزیزانم ئەمەش وەک ئەوی / دەورێک بڵیندین و زەمانێک نەوی
چەرخە. کەوا سووری دەداتن ژیان / سەددی دەڕووخێنێ ئیرادەی زەمان

شاری عەزیزی‌مە کەوا گەورەبوو — سێ مەرەسەی گەورەی لەدووریەک هەبوو
یەکێ سەعادەت[٢٠١] بوو ئیدی پەهلەوی[٢٠٢] — مەکتەبێکانی بەسەوادیش قەوی
یەکی کچانە هەبوو پەروانە[٢٠٣] نێو — بەرزەکچانی هەبوو جوان و پەشێو
یادی مودیرانی ئەوانیش بەخێر — کاک عەلی مەحموودی، مبەللیغی زێر
خانم شوجاعی بوو مودیری کچان — قەددی چکۆڵ، چاوی بەکاڵی نیشان
قازی[٢٠٤]،فەهیمی[٢٠٥]،مودەڕیس[٢٠٦]،مەولەوی[٢٠٧] — فازلی[٢٠٨]، ئەسحابی[٢٠٩]، فتووح[٢١٠]، ئاکۆیی[٢١١]
عیددە موعەللیم بوون زەمانی قەدیم — دانەری فەرهەنگ و سەوادی سەلیم
ئەو هەموو چەرخەی کە ژیان دای بەوان — دابنانە سەر تەختی بڵێندی زەمان
وەک باغەوانانە گوڵیان پەروەراند — هەردەمە ریشێک و گوڵێکیان چنەقاند
داخە... لەپڕبایە گوڵ و داری برد — دەستی زەمان، کێوی بڵێند بوونەگرد
لەو هەموو دار و گوڵە دەستی قەزا — هێندێکێ زۆر کەم نەبێ، هیچی نەما
شینە لەشار، دار و گوڵی ئەو دەمی — بۆنی دەدا بۆنی گوڵی سونبلی
یادی ئەوان ماوە لەنێو مەکتەبان — بەحسی قسەی خۆش و گۆتار و بەیان
شۆقی چرای نەفت و فتیلە و عەزیز — ئەورۆکە هەر شۆقی دەداتن بەریز
ڕەبی نەکووژێتەوە شۆقی چرا — یادو لەنێو خەڵکی هەبێ بۆ سەفا
من بە تەمەننایە دوعامە ئەلان — غەرقە لە نوور بێتن چرا و مەنزلان



خات زلەخا[٢١٢]، کاکە کەریم‌خانی[٢١٣] پیر — کاک عوبید[٢١٤]یش و نەچێتن لەبیر
مینە مجێور بوو عەلی خادمی[٢١٥] — ئەحمەدە کوڵ[٢١٦]، سۆفی حەسەن[٢١٧]، فازلی[٢١٨]
فاتمی مەدرەسە[٢١٩]، ژنیکی هەژار — دایکی هەموو مەکتەبیکان بوولەشار
ئەو ژنە ژن‌بوو و بە هیممەت لەپیاو — دوا نەدەما، حەیفە لەدونیا نەماو
جەمعی ئەوانە هەموو خزمەت‌گوزار — فاتیحەیەک بێ لەسەریان بەرقەرار



یــادی رەئـیس کـاکــە رەحـیم لەشکـری[٢٢٠]
پــیاوێکی ئــاغا و حــەلیم، خــۆش زبـان
خــۆشەکــە پـەروەردەیی ئـەو مـەکـتەبم
چـەرخـی زەمـان گـەرچـی فـڕانـدی لەمـە
نــێوی لە فــەرهەنگی وولاتــم هــەیە

بــابەکــەم ژێــردەستی کــەچوون بـنگلی
خـزمەتی مــەعلوومە بــە دەوری زەمــان
یــادی بکــەم تــاکــوو لەدونـیا هـەبم
یــادی هــەچەندێکی بکــەبن هــەرکــەمە
نــامرێ پــیاوی بــەشەرەف زیــندەیە

X



ئاغای رحیم لشکری
رئیسی اوقاف و معارف



ئاغای علی محمودی
مدیر مدرسه سعادت



ئاغای محمد مبلغی
مدیر مدرسه پهلوی



خانم وجیهه شجاعی
مدیر مدرسه پروانه

## دوکتورەکانی سابلاغ[٢٢١]

داشامەجید وەختی شەوان فەعلەکە
دێتەوە ماڵێ لەسەری کارەکە

گیانی قوڕاوی و بەدەستی خەبار
زەردە خەنە یا پێکەنین جار و بار

وردە منداڵانی بەخۆشی و ئەوین
«بابەکەمان هات» و دەکەن هەڵپەڕین

بەکێ خەبارانی لە دەستی دەبا
ئیدی لەدەست خەرجە ڕزیوی دەبا

بابە بەخۆشحاڵی دەگەڵ بەچکەکان
تاکوو درەنگێکی دەکا گەپ لێدان

کووچەیی خواری کە بڕێک بێبەخوار
تاجرەکەش دێتەوە ماڵێ لەکار

چوورتکە و ماشێنیحیساب باغەڵی
فیکری لە سەدلایە، دووسەد تێکەڵی

کەس نیێ بکا شادی کە باب هاتەوە
فرسەتی خۆشحاڵی نییە ماڵەوە

فیکری لەسەر ماڵ و چەک‌و سفتەیە
ماڵی جەهەننەم کەسێ وززەی نەیە

وەختی خەوێ فەعلەکە، ماندوو لەکار
دەنووێ خەبەردار نیێ لە حاڵ و لە پار

تاجرەکە، نایە خەوی فیکری زۆر
نیوەشەوێ دێتە خەوی مۆتە بۆر

نێوی لێفە وبانی پڕە مشک و مار
مارو مشک نیێ، هەموو فیکرە و خەیاڵ

وەختی سەرەمەرگی کە هەردوو نەمان
هەرکەسە جووریکی دەکا قوڕ پێوان

ڕۆڵەیی تاجر دەگری خۆشە دڵ
«بابە نەما، گەیمەوە مەقسودی دڵ»

ڕۆڵە فەقیرش وەکوو تاجر هەرا
«بابە نەما خەرجە ڕزیوم بڕا؟!»



یادی دەکەم دوکتوری شار وێنەتان[۲۲۲]
شالک[۲۲۳] و خانم‌میزدال[۲۲۴] نەچێ بیرتان

چاو ئێشەی کیژان و کوڕان، گەورەکان
ماڵە مەلا مەولوودی دەرمانی وان[۲۲۵]

ماڵە مەلای دەرمانی دوو جووری بوو
نەوعێکی سوور، ئیدی بنەوشیان هەبوو

چەندە بە ئاواتیوە بووم ئێشی چاو
تاکوو بڕەنگێنم بە دەرمانی ناو

ئاواتی ئاوا، نە فەقەت بوو لە من
جەمعی منالان هەموو هەمدەردی من

دەستە شکاو، پێیە شکاو، سەر شکاو
لای قادری چاوڕەقی[۲۲۶] کاری تەواو

خوشکە خەجیج[۲۲۷] شۆرەتی شێرخانی بوو
دەرمانی چاوانی دەدا زوو بە زوو

ڕەحمەتی لێ حاجی سۆفی مستەفا[۲۲۸]
نێوکی دەهێنانەوە، دەرمانی لا

حاجی مەلا[۲۲۹]، یەکە ددانسازی شار
بەغدا سەری[۲۳۰] پێش لە ئەوی بوو لەکار

کاکە ئەیوبیشم[۲۳۱] لە شاری هەبوو
دەردی ددان ئێشە لەلای چادەبوو

حاجی مەلا، زیدی ددان ئێشە بوو
نەسلی ئەوی، شووغلی ئەوی گرتە دوو

ئێستێ لە شار ماوە لە نەسلی ئەوی
کاک عەلی جەفایی[۲۳۲]، کوڕی، بەهمەنی[۲۳۳]

مامانی شاری بوو بەنێوبانگ و چاک
دەستە ژنی چاک و جەمال جوان و پاک

شەربەتی نێو، شیرنی وەکوو شەربەتێ
ڕەببی خودا، بڕژێ سەری ڕەحمەتێ

ئامینە خانم[۲۳۴] چ پەرستاری پاک
جەمعی نەخۆشان بە وجوودێوە چاک

هاجەرە خانم[۲۳۵] بوو بە دەوری نەخۆش
فیکری لەسەروان و ئەوێ دڵ پەرۆش

یەک‌جێ نەخۆش‌خانە هەبوو نێوی شار
ئەو شێروخورشیدە[۲۳۶] هەبوو زۆر بەکار

دەرمانە، خۆڕایی هەبوو بۆ خەڵک
زۆر ئەسەری باش و بەجێی و کەلک

کەس نەبوو بۆ دوکتوری پووڵی بدا
تەختە بە ئیختیاری نەخۆش و دەوا

پووڵدار و بێ‌پووڵە، مداوا دەبوو
خەڵکی ئومێدێکی بە ئەو جێ‌یەبوو

ئەوڕۆ لە شار زۆرە جێگای وا بڕا
ئەمما فەقیر فووڕ بەسەر و هەڵوەدا

## « دەواخانەکانی[٢٣٧] سابلاغ »

سێ بوو دەواخانە دەنێو شاریدا
مەرکەزی و مەولەوی، ئیدی شەفا
مەرکەزی ئەییوبیان، شەفا دوو نەفەر
سالح، حەکیمزادەیەکی بوو لەسەر
سێیەمی دەرمانی کەبوو، مەولەوی
مەشغوولی شێعران و بەدەست خەت قەوی
دەرمانە چەن چابوو نەخۆش بۆی دەوا
نۆراژێنێک کاری دەدەرزی دەدا
دەرمانی ئێستێ. شیری سەرتۆ گراو
کوا ئەسەری قاپێکی شیر، گۆمە ئاو
قیمەتی کەوتۆتە پلەی نێردیوان
هەر رۆژە نرخێکی هەیە سەر زبان
غەیری ئەوەش گۆشەیی ئەنبارە جێی
مەیدانی مەنگور هەموو نەوعانی لێی
وەختێ دەگا دەستی نەخۆشی فەقیر
سەر تاتەشواریێ بە، بەفەبری ئەسیر
کوپە لێدان، ئیستیکان دەردی بڕی
زەنجەفیل و دارچینە، سەرما خوڕی





گومی پردی سوور و مەڵەی هاوینانی

## عاشیرەت و عایشێ کوللێران

کوانێ سەدای بەرزی کولیچەی بەڕۆن  ئەو وەکوو کوللێرە وەلی سەر بەڕۆن
نابە هەرای بازیدی وەختی بەیان  وەختێ کە عاشیرەت[٢٣٨] و عایشێ نەمان
عایشێ کوللێران[٢٣٩] و کووچەی سەردروان  مەشهووری سابلاغی کولیچانی جوان
کوللێرە ناسکەی عاشیرەت بێ نەزیر  دانەی قڕانێک بوو ئەوەم دێنەبیر
کوانێ مەلای ناتان[٢٤٠] و هێلکەی کولاو  نێو گوزەرێ، بەردی لەسەر یەک نەماو
نانی گەلاگوێزە بوو سێی سێ قڕان  پێش هەموو دوکانێکی پڕبوو لەوان
ئێستێ دەلێی تایشە جووتنی گران  دندانی مەسنووعی و عەزابی گران
تەنکە لەبەر سووکێ، وەکوو کاغەزی  چیرە، لەفەتیری ددانم بەزی
لایەکی سووتاوە، قەراغی چزۆر  دوو بەشی ناخورێتن لەبەر تامی سوێر





گومی باغی میکائیلی

# رەمەزانی[241] سابلاغ

داشا مەجید وەختی ئێوارەو شەوان ڕەنگی هەورسوورە لە نێو ئاسمان
دێنەوە بیرم کەلەمزگەوتەکان یا لەحەساری، لەسەری تاتەکان
لاوانی شاری هەموو مەشغوولی نوێژ سەففی جەماعەت پڕ و ساف و درێژ
ئێستێ کەمە، دین و ئیمان و خودا جەمعی بەسێلاوی خەراپەی بڕا
ئاهی فەقیران و سەغیرانی زۆر نێتی ئەسەر لەو دڵ و قەلبانی کۆر
زەوقی نەماوە ڕەمەزان لای عموم وەختێ دەنێو شاری کەوت کوندی شووم
کووچە لە خوانچە و تۆفرۆش پڕدەبوو دەورو بەری خوانچە هەموو زاق و زوو
گۆشەیی هەرکووچە بەدەستە ژنان بەزمی فسەو باسێ دەگەڵ شتخوران
سەفی تەراویحێ لەمزگەوتەکان دەنگی سەلا، زیکری دەدەروێشەکان
دەرکەیی ئاسمانێ هەموو ئاوەڵە تاکوو سەدای زیکری بچێ چەلچەلە
ئەو هەموو دوکانە هەتا پارشەوێ بەزم و حیکایاتی چ خۆش بوو لەوێ
ئەورۆ نەماوە بەرەکەت نێو گەلێ هەرکەسە جوورێک بەکەسێک هەڵدەلێ
شەو تۆوی‌سوێر خۆش‌بوولەنێو کوچەکان دانەی پەنادێکی بوو یەک ئیستیکان
«ئەوتۆوە زۆر سوێرە بەعەینی بەڕوو» «مەغزانی بادامی‌یە ئەورۆ هەموو»
پەشمەک و خورما و زولوبیای جوان ڕێز بوو سەری خوانچە و دۆکانەکان
کاکە گەزۆ شیرن وەکوو قەندی بوو لایەکی خوانچە بەگەزۆی پڕ دەبوو
کوانێ بڕێشکە وگەزۆ سەلکی پەناد زۆر ڕەمەزان هات و وولامی نەنارد
تاکوو سەلای پارشەوی هەروا هەرا شەوچەلە، جۆرابێن و بەزم و هەرا
جوانە جحێڵانە دەهاتن لە ژوور تێگرا بەگۆرانی کوتن جووربەجوور
هەرکەسە دۆستێکی لەکوچێک هەبا بولبولی شەیدا بوو بە دەوری گوڵا

کوانێ خۆشی ئەودەمی، ئێستێ لە تار    فیکری خەڵک تێکەڵە گەڵ فیکری پار
هەرکەسە دەردێک و غەمێکی لەدڵ    چونکی لە دەستانی چووە سوورە گوڵ
ئێستێ بەچی خۆشی بکا، گوڵنەماو    دارە گوڵی ویشکە، نەماوە هەناو
یادی تەنیشت کوورەیی مزگەوتەکان    وەختی ئێواران و شەوان و بەیان
بان و حەسار و دەری مزگەوتی سوور    پیر و جحێڵ، پڕ بوو دەر و بان ژوور
یادی مەلا شێخ قادر و جومعەکان    حەسرەتە نابینم سەفی زۆری وان
پیرو جحێڵ، جوانە منالی بچووک    تێگرا بە رۆژوو، بە عەمەڵ وەک هەلووک
جەمعی منالی گەڕەکێ، چاو لەبان    کەنگێ مەلا بانگێ دەدا بانگی جوان
تاکوو بخوا شەربەتی سووری گولاو    توونیەتی بشکێنێ کە رۆژوو تەواو
ئەورۆ چ حەسرەت، کە نەما دابیوا    بەفسە هەموو چاک و عەمەڵ لابرا
خەڵکی قەدیم روحمی بەیەک دادەهات    ئاگا لە جیران و فەقیری وولات
ئەورۆ هەموو فیکری لەسەر خۆیەتی    کاری بە جیرانی نییە، تۆیەتی
خەڵکە، کە گۆڕاوە دەروونی بە دەرد    روحمی نەماوە، دڵی وی بۆتە بەرد
دڵڕەشە عالەم وەکوو ڕەنگی قەڵێ    تووتییە، هەرچێکی بڵێی وا دەڵێ
هەر دەڵێی نێزیک بووە ئاخری زەمان    خەڵکی بە دووی کاری خەراب، پالەوان
تۆوێکی هات چاندەوە جووتێری ژین    تێکرا هەموو عالەمە هاتوونە شین



## بووک هێنانی[٢٤٢] سابڵاغ

داشا مەجید وەختێ هەڵاڵنی سوور
شاخی دەرازێنن وەکوو کێوی توور

گەورەکچان، گۆزە لەسەر شانییان
سەر لەبەیانی لەسەری کانییان

ئاوانی جۆباری بە خوڕ دێتە خوار
عومری بەشەر ئاوە لەنێو جۆیەبار

گۆشەیی جۆباری سەوز کووزەلە
پێنگە دەگەڵ گیا و گژان تێکەڵە

دێنە دەرێ تیشقەیی رۆژێ لەکێو
بێ خەبەری و دەرد و غەمی با لەنێو

هەورە دەبارێنێ بە نمنم لەخۆی
قەترەیی بارانی بەهارانی جۆی

بەفرانی زستانی عومر چۆتەوە
ڕەنگی وەکوو مووی سەری من بۆتەوە

عومرە بە خۆرایی گوزەر بوو لەگیان
یەک قەدەمی چاکی نەنا بۆ گەلان

مەسڵەحەتە، وایە عەزیزانی گیان
بێمەوە سەر باس و قسەی بووکهێنان

خوانچەی[٢٤٣] شەوانی خەنەبەندانێ کوا
سوارە لەکوێ بووکی لەکوێ پیادەکا

سوارە دەچوو ئەوسەری تەقڵە بەدەست
دایدەکوتا تەقڵە لەسەر عەرزی سەخت

شەقشەقی ئاوزەنگی و ڕکێفانی سوار
حیلەحیلی ئەسپی لەکووچانی شار

هەرکەسە جووڕێکی ئەسب تێن‌دەدا
بووکە لەسەر ماینی بە دەوری هەرا

زاوا بەپێشوازی بووکی خۆ دەهات
سێوی بەدەست، بۆسەری وی هەڵدەداشت

سێوە لەشیرنی بوو بەڕەنگانی جوور
زەردو سپی‌و کەسک‌و بەشی زۆری سوور

شەو خەنەبەندانە هەتاکوو بەیان
لێی بووکچان وکوڕ و لاوی جەوان

بەزمی دەفە و قامێ دەگەڵ پێکەنین
کەس نەبوو نێو باغی بکا گوڵ چنین

خوانچە دەرازاوە بە ئەنواعی جل
دەبرا بۆماڵ زاوا عەزیز بوو لە دڵ

وەختێکی بووک دادە بەزی بەرمە خۆش
دەنگ و هەرای سواری دەکەوتن لە جۆش

دوایە لەپاش یەک دوو سەعاتێک کەبا
تەقەی تفەنگ پڕ دەبوو عەرزو هەوا

زاوا له ئەو بەزم و هەرابە چ خۆش — شەربەتی ئاواتی کەکرد بوو بەنۆش

دوای بووکێ سێ رۆژێ لەماڵی ئەوان — چێشتنە دەبردرا ماڵه زاوا جەمان

هەڵوا له سەر، نان و خۆرشت و پلاو — یەک دوو مەجومعێک بوو لەبۆ تازەلاو

داخی گرانم کەنەما دابی‌وا — هەرچی هەبوو کۆنە بە تازەی درا

تازە لەکوێ خۆشی قەدیمی هەیە — سونەتی کۆن شارە هەرام بووەیە

بۆچی دەبێ پشت دەقەدیم شارەکەین — هەرچی لە دەرهات و قەبوولی بکەین

نامهەوێ زیندانی بن چواردیوار — مابلی چاکەی بن، نەکارانی خوار

رەسم و ریگا بەلکی بمێنێ لەشار — سابلاغی کوردانم نەچێ بۆکەنار





بەریز کاک سعید ماملی یەکیک لە دەنگ خوشەکانی سابلاغی خوشەویست و کورەکانی دەستی راستی کاک محمد ماملی و دەستی چەپی کاک هاشمی جووانەمەرگ.

## دەنگ خۆشەکانی سابلاغ(٢٤٤)

مەشهووری سابلاغێ بەدەنگ نێو گەلێ
عابید و قاقی و سەعید مامڵێ

سەید حەسەنم دەنگی وەکوو زەنگوڵە
شۆڕەتی کابانە گوڵی سەرچڵە

ئێستێ لە ئاسمانە نەوایی ئەوان
سووڕێ دەدا، چاوی لە شارە شەوان

تیغی زەمان ژینی ئەوانی بڕی
بای ئەجەلی بردی لە داران چڵی

هەورە ڕەشە هاتوو بەفر کەوتە شار
ژین و سەفا کەوتە دەرێ هەر لەشار

گەرچی کە زۆر دوور نیێ، هەوا بێتە ساف
هەورە بچێ، غەم بچێ بۆ کێوی قاف

ئەمما هەتا مانگی بەهار دێتە پێش
دڵ بە غەم و ناڕەحەتە، پڕلەئێش

کوانێ نەوایەک کە لەدڵ غەم بەرێ
خەڵکی کە کەوتۆتە خەوێ ڕاپەڕێ

دەستی بەیەک عەینی قەدیمی زەمان
چەرخێ بدەن، چەرخێ بە چەرخی زەمان

چەرخە، کەوەستاوە بەدەست لەنگەرێ
بێتەوە چەرخین و غەمێ لابەرێ

چونکێ دەروون ماتەمی گرتۆ لەژین
نێوی ئەوێ پڕبووە کێم و برین

تاکوو نەیە سەر لقی دارێ، گوڵان
بولبولی دڵ ماتە، بەدەردو غەمان

ئەودەمی گەر مانگی بەهارم گەیشت
هەورە لەسەر لاچوو ویسالم، بەهەشت

سواری دەبم ئەسبی مورادم لەشار
گوێ لە نەوای بولبولی نەک قارەقار

تەیری ئەسیرم لە قەفەس بەردەدەم
تاکوو بخوێنێ بە هەوای باغەکەم

نابێ کە ڕاوچیانە بدەن لێی بەتیر
چونکی ژیانی نەبوو، دایم ئەسیر

بفرە، شەقەی باڵی بدە تەیرە گیان
جێی هەموو دەنگ خۆشی نەماون ئەلان

دەنگی تۆ فەرمانی خودا سەر دەدا
بۆیە لە دڵ دەرد و غەمی لادەدا

پیر و جحێلان و منالانی شار
مونتەزیرن تاکوو بخوێنی، بەهار

# «گۆرانی بێژەکانی سابلاغ»[٢٤٥]

هەڵپەڕین و شایی دەسەرخۆشەکان جۆشی دەهێنا بە کوڕان و کچان
تا مەنیج حەیرانە[٢٤٦] هەبوو قادرە کوێر عەبلای سنجانی[٢٤٧] و دەف و قامی زۆر
کاک قادر[٢٤٨] و خوشکە مەنیج پێکەوە بەزمی هەبوو شایی لەنێو کووچەوە
نابە سەدای دمبەگی ڕەحمانە گۆج[٢٤٩] ساڵ و ئەیامە لە دونیای کردۆ کۆچ
کاکە برایم[٢٥٠] کەبە هەلامە بێت غەرقی لەڕەحمەت دەگەڵ هەمکاری بێت
تاکوو ئێوارێی و هەتا دوای شەوێ خەڵکی لە شایی بوو لە بەزمی ئەوێ



قادری تارزەن[٢٥١] کە نەماو کاک عەزیز[٢٥٢] دەنگێ لە تار نابە و دڵی ئێمە زیز



کاکە مینە[٢٥٣]، موستەفای موزیقەچی[٢٥٤] هاشم[٢٥٥] و سەرکار مەجیدم[٢٥٦] هەردەژی



## ئاکارە جوانەکانی سابلاغ[٢٥٧]

داشامەجید خەڵکی لەسەر ئارەزوو — بەڵکی ببێ، وەختێ منالی نەبوو
سەد پیر و چاک و دەر و دوکتور دەچێ — بەڵکی خودا بیدا منالێکی پێ
عاقیبەتی ڕەحمەتی مەولا بەوە — جوانە منالێکی دەداتن بەوە
ڕۆژ و شەوان دایکە لەکن لانکی وی — لای، لایی تا جوانە منالی بنوی
خواردن و خۆراکی حەرامە ژنە — تا خەوی خۆشی بێ نەمامی کنە
وەختێ کەچوو بەکتەبێ خونچەی دڵی — دایە لە خۆشیانی دەکا هەڵپەڕی
ساڵ و ئەیام دەگوزەرێ عومرە دەچێ — ڕۆڵە بە لاو، دایکە کەی پیر دەبێ
هیچ بیری نایە دەمی منداڵی خۆ — ئێستێ کەواگەورە بووە پڕشکۆ
سینگی وەکوو شێرە بە بازوو قەوی — تاکا سەری خۆ بۆ کەسانێ نەوی
ساڵ و ئەیامێکی کە لێی دەگوزەرێ — ڕۆڵە جحێڵە، بە عیشق هەڵدەڵێ
عاقیبەتی ڕۆڵە دەچێ بێتە باب — دایە بەپیری دەبێ حاڵی خەراب
دایە نەخۆش، فیکری لەسەر ڕۆڵەیە — ئەمماکورە، فیکری ئەوی هەر نییە
تووندە و قەڵسەو عەسەبانی مودام — دەگەڕێ بەهانانی عەجایب بەشام
مودەیەکی دیکە کە لێی بووگوزەر — فیکر و خەیاڵی ژن و ماڵی لەسەر
دەچنەوە خوازبێنی و شادی دەکەن — تاکوڕی ساحێبی ژن و ماڵ بکەن
ڕۆڵە ژن و ماڵی هەیە نێوی ماڵ — قەند لە هەرای بووک و خەسوو بۆتە تاڵ
هەر ڕۆژە قێژێک و هەرایەک هەیە — ماڵی جودا، بووکە هەرای بۆ وەیە
«بووکە دەگەڵ ماڵی خەسوو نێتی ژین» — «لەو ڕۆ بەوەوەی واوە دەبێ جوێ ببین»
وەخت و زەمانێکی شەڕ و ماجەرا — ڕۆڵە دەکا ماڵی لەبابی جودا
ڕۆژێ لەبازاری، هەزارانە کار — دێتەوە نێو ماڵی پڕە دەستی بار

هەفتە و سێ هەفتە و دوو مانگە جار / ناگرێ، ئەحواڵی لە دایکی هەزار
ئەمما شەوو رۆژێ دوو سەد دەفعەیان / ماچی دەکا جوانە چکۆل بەچکەیان
ژین و حەیاتی بە فیدای بەچکەلە / خۆشی‌دەوێ چونکی ڕووناکی دڵە
هیچ وەبیری نایە کە رۆژێکی وا / مەحبوبی دایک بوو بە سەد شەوقی وا
دایکی لەبەر وی خەو و ژینی حەرام / نیوە شەوێ شیری دەدایە بەتام
ئەورۆ فەرامۆشێتی ئەو دەم چ‌بوو / فەرخە منالێکی بەقێز و بەبوو
دایە لە دووری ئەوی ناڵەی دەکا / «داخوا کوڕم رۆژی چلۆن شەو دەکا»
هەربە نەخۆشی لەسەری فیکری وی / ئەمماکوڕە فیکری کوڕ و ماڵی دی
ئەوکابە ئەو بۆ سەری چاکان دەچێ / بەڵکی فەنا بن دایو باب جێ‌بەجێ
رۆژ و شەوێ فیکری ئەوی دایو باب / بمرن، بگاتن بە میرات و حیساب
دونیا وەفای نیتن لە قاموسی ژین / چاکترە فیکرێکی بکەین بۆ ئەوین
تاهەیە قودرەت بەدڵ و گیانە ساغ / چاکە بکەین دوایە نەکەین ئاخ و داخ
وەختێ زەمان، شکڵی عەوەز بۆ لەلا / جەرگ و هەناو، فیکری ئەوایە و ئەوا
بۆچی لەخۆ فیکرێ نەکەین چاوی من / عیللەتی چێ، هاتنی ئێمە لە ژین؟
ئایا ژیان نوستن‌و خواردن وخەوە / یانە شتێکی دی لە پشت پەردەوە
گەرچی کەسێک‌حاڵی نەبوو فەلسەفەی / عاقیبەتی چوو لە دەر و مەدرەسەی
ئەمما ئەساسی ئەوەیە کاکە گیان / خزمەتی ئینسانی بە دەوری زەمان



## خەتەنەسوورانی سایلاغ[٢٥٨]

کوا خەتەنەسووره لە نێو شاری ما؟ / کوا قەلەکە، چۆلەکەکە[٢٥٩] هەڵفڕا؟
ئەو هەموو شیرنیبوو لەدەوری مناڵ / ئەرۆ نەما مۆدی ئەوا بوو بەتاڵ
بەزم و سەفای مەجلیسی ئاوا نەما / ئەورۆ چکەس باسی ئەوانە دەکا
هەرۆژە رەسمێکی قەدیم تێکدەچێ / رۆژێکی دێ رەسمی قەدیم نەبێ؟
چاوە بەگریانە لە یادی ئەوا / ماڵەکە وێرانە بناغەی نەما
چونکی بناغانی ئەوی هاتەدەر / کوانێ قەراری دەبێ خانوو لەسەر
بۆنە قومارانی مناڵی بچووک / وەختێکی، بووک بووکە هەبوو وئاڵەبووک
تا بووکەچینی، قەدەمی نا بەپێش / بووکی لە دەستیدا منالانی پێش
دوکتورە وەختێکی دەسی کرد بەکار / مەجلیسی خۆشی خەتەنە چۆکەنار



مەنزەرەیەکی دیکە لە پردی سوورکە دوای تەواو بوونی سد بە داخەوە تیک درا.

## بووکە بە بارانە[٢٦٠]

بووکە بە بارانی دەوێم هاتە بیر — عەرزە، کە ویشک بێ گەنم نایە گیر
بەزمێکی زۆرخۆش بوو بە وەختی بەهار — پووڵی وەخەرکەبن لەخەڵک بۆ قومار
وابوو بەزم پێکەوە جەمعێک مناڵ — تێکرا بڵێن پێکەوە بەر دەرکی ماڵ
«بووکەکە، بارانی دەوێ کاکەگیان — ئاوی منالانی دەوێ مامەگیان»
«دەرزیلەی زۆرجوانی دەوێ بۆکچان — ئاوی نێوگەنمانی دەوێ بۆگوڵان»
هەرکەسە، دەیڕشتە سەری سەتڵە ئاو — شیرنی و پووڵ بۆمە، نەبێن بەشبڕاو
پاشی دوو سێ ساعەتێ هەورانی ڕەش — دابدەگرت ڕوخساری دەئاسمانی گەش
هەورە دەبباری ودەگریا حەوا — خەڵکە چخۆشحاڵ بوو لە گریانیوا
خۆشبوو لەوەی هەورەکە بارانی کرد — بەعنی خودا بێدڵی خەڵکی نەکرد
ئەوجار شتانی کە خەڵک دایبوو پێ — بەشدەکرا بەینی ڕەفیقان لەوێ
گەرچی منالانەیە ئەو بیری من — ئەنگو ببوورن لە گوناهانی من



ناقە داری حەزایی ساڵی ٥٣

## سەمەنی لێنان (٢٦١)

وەختێ بەهاران سەمەنی سازدەبوو — دەوروبەری تەندوورە، کچ پڕدەبوو
هەڵپەڕین و شایی لەدەوری تەنوور — جوانەکچ و بەرزە ژنی وەک بلوور
فیکری ژنان وابوو کە نیوەی شەوێ — عایشێ و فاتم(٢٦٢) پێکەوە دێنەوێ
خەڵکی گەڕەک تێکرا هەتانیوەشەو — فیکری هەموو کاری هەبوو غەیری خەو
هەرکەسە جوورێکی دەکرد بەزمەخۆش — نارە وچەپڵەو دەفەبوو. قامیخۆش
دەنگ و شەقەی مەنجەڵ وکەوگیر بە شەو — هەرکە سەکارێکی دەگرتن لەئەو
لای سەمەنی نیوەشەوێ چۆل دەبوو — وەختێ بەیان، ماڵە بەماڵ بەش‌دەبوو
هەرکەسە ئاردی بەشی خۆی ناردبا — قسمەتی داندرابوو لەوێ بێ‌هەرا
تا سەمەنی باسی هەبە سەر زبان — خۆشە، قومارێکی بڵێم ئیچەلان
هەڵدەپەڕین جوانە منالانی چووک — تێکرا بەدەوری سەمەنی عەینی بووک
پێکەوە دەستیان دەمل و دەستی بەیەک — شێعرانی خوارێیان دەخوێندن(٢٦٣) بەیەک
«دەچمەوە نێومالی گەڕەک ئەرمەنی — قوڵتەدەدا قوڵتە لەوێ سەمەنی»
«دەچمەوە نێومالی گەڕەک جوولەکە — قوڵتەو بۆنی‌دێ لەوێ کوولەکە»
«دێمەوە نێومالی مووسوڵمانەکان — دەنگی دەیاسینی دێ قورئانی جوان»
گەرچی عەمەل نێن بە ئەمری خودا — چەرخی زەمان دێت‌و دەچێ بۆفەنا
حەیفەکە وەختێکی لە ئەسپی موراد — سواربن، بکەین عاڵەمە غەمبار و سارد
بابکوتین تانەفەسی دەرنەیە — یا بۆچی ئاکاری فلان، غەیرەیە؟
زۆرم ئەوا دیوە، کەکەوتۆتە ژێر — وەختێکی نەیداوە بەئاکاری خێر
عەدل و سەفا لایەقی مەولایە هەر — کوانێ لە عەبدانی دەخۆ دێتە شەر



## «چێشتی حاجی‌لەگ‌لەگ[٢٦٤]»

چێشتی حاجی‌لەگ‌لەگەکەم هاتەیاد   لەگ‌لەگە زستانی چلەبڕ دەکاد
بەفری حاجی‌لەگ‌لەگی دوای چللەیە   ئەورۆ نیشانێکی لە سەرمای نییە
هێلکەی لەگ‌لەگ دەبوو هەر بەستبای[٢٦٥]   چەندە بەسەختی بوو خودایا هەوای
دوابە، کە نیزیکی بەهارێ دەبوون   گیاو گژو پنگ‌و گێلاخەش دەبوون
پەیدا دەبوو لەگ‌لەگەکەی گۆشەبان   وەعدەیی چێشتی‌وی دەهات بۆژنان
مەنجەڵی گێلاخە بەکشمیشی خۆش   لێدەنرا نێوی حەسارێ بەجۆش
منداڵی کووچانە هەموو دەوری وی   هەرکەسە قاپێکی بەدەستی لەوی
فیکر وغەم ودەرد و پەژاری نەبوو   جەمعی برا خەڵکی، لە شاری هەموو
روحمی هەبوو خەڵکی بە دەردی فەقیر   نەک وەکوو ئەورۆکە ئەوی چێ لەبیر
پێکەوە منداڵی دەدەوری حەسار   شێعرانی خوراێیان[٢٦٦] دەخوێندن بەجار
«حاجی لەگە، لەگ لەگەکەی گەل گەلی   ئەورۆکە سیمان دەخوێ بەشکی عەلی»
«چویەتە ئاسمانی تەبەق سەر تەبەق   ئێرەکە سەر عەرزییە کۆشک و کەلەک»
«یاخوا بەخێر بێیەوە سەرچاوی خەلک   ماندوو نەبی کاکی عەباکەت بەلەک»
چاوی لەئەو بەزمە، لەسەر گۆشەبان   لەگ‌لەگە بێدەنگ بوو، کە لێی بوو عەیان
خۆشن منالانە بەهاتنی ئەوی   نابێ وەفاداری کەلاچێ لەوی
گەرچی لیباسی لەسەری هەرتەناف   دەیبرد کە هێلانە[٢٦٧] بەوی کاتە ساف
یا چاڵووک و چرپی لە تەندورە برد   تاکوو بکات دەورانی هێلانە گرد
ئەمما بەسەد کاری ئەوا هەر عەزیز   نەمدی کە خەڵکی بێ لەئاکاری زیز
ئێستێ ئەوە، زۆربەوەفاتر لەمە   خوی لێنەگۆرا بە هەرا و مەحکەمە



# «مانگ و ڕۆژگیران»[٢٦٨]

یادێ لە سابڵاغی زەمانی قەدیم     مانەمە ئەورۆکە ئەوانەی کەدیم
وەختێکی ڕۆژە دەگیرا یانە مانگ     شارە بە هاواری دەهاتن بە بانگ
دەروێشەکان کۆڕەیی زیکریان دەبەست     هەرکەسە لەشتێکی دەدا داربەدەست
یا لەبنی مەنجەڵی دەدرا بە بەرد     یا تەنەکە یا دەفە، یا ئاهی سەرد
مانگە هەتا بەر دەبوو، ئەو شارە مات     دەنگی سڵاوات و مناجات دەهات
ئێستێ لەوانە خەبەرێک نیێ لە نێو     کەس بۆئەوان ناکا خەباڵی پەشێو
چەرخی زەمان بۆنەوە نەقتاشی مات     هەر ڕۆژە ڕەنگی خۆ لەیەکێ دەدات
جوانی دەکا نەقشی دەداتن بە ڕوو     هاو دەم و دەیبا بۆ موقامی سەروو
گەورەیی گەڵ غەررەیی بەکناگرن     زەهری هەلاهیلن بەلای دڵن
بۆیە بەجێی دیڵی فرێ هەڵدەدا     زۆر لەجێگای خوار و لە عەرزی دەدا
چاکە، کەنابێ غەم و دەردی بخوێن     زۆر بەپەلە بۆسەری کاران بڕۆین
چەرخە کە نەقتاشە دەکا کاری خۆ     لادەنێ ئەو هەورە نیبسێ‌دا بەتۆ
وەختێ کە لاچوو لەحەوا هەورە ڕەش     عالەمی شاری هەموو دڵخۆش و گەش
شۆقی هەتاوێ لەوەسەت ئاسمان     گەرمێ دەدا پیر و نەخۆش و جەوان
خۆشن و خۆشن لە عەتای زەمان     خەڵکی کە لەرزینی هەبوو دەستی وان
یاخوا بەخێربێ قەدەمت بای شەماڵ     دەرد و غەم ونارەحەتی بۆ گەماڵ
بۆچی بەزوونر قەدەمت دانەنا؟     گریان و زووخاو و غەمە کەمبیا
ڕەببی بە دووریەوە چی زستانی سارد     مانگەشەو و شۆقی هەتاوت بڕاند
نیسێ[٢٦٩] بڕۆ دەگری کەچەڵ ڕۆڵەکەت     تاوە وەرە دەگری زەریسن ڕۆڵەکەت

## بیر و باوەڕی سابلاغی قەدیم[٢٧٠]

داشا مەجید سەرمایی پاییزە هات    دارەگەلاو بەرگی پەڕینە وولات
جوانن پەڕەندانی بە پۆل‌پۆل دەڕۆن    لەگەڵ‌لەگ و سیروو و کەوی شاخی خۆن
دەچنەوە گەرمێنێ لەسەرمای توند    ئێرە بەجێ دێڵن لەبۆ دەنگی کوند
هەرشتە دەخزێتە کونێک دەستی با    دەگرێ لەسەرماو سەهۆڵێ پەنا
دارە چنار رووتە، سەری قشقەلە    نێ لەسەری دەنگ و سەدای بولبولە
بەفرە هەموو جێیە وەسەر کەوتووە    بەختی فەقیران وهەژار نستووە
رۆژە ئەگەر ئەورۆ لەبن هەورییە    لەرزین وسەرمای وی هەمیشە نییە
عاقیبەتی، چڵلەبی زستان دەچێ    ئەهەموو دەردانە بە پێی‌وی دەچێ
مانگی بەهارانێ کەدێ سوورە گوڵ    بولبولە سەر دارێ دەخوێنێ بە کوڵ
چەرخە دەسووڕێنی، لە خۆ وانییە    پۆست و مەقامی تۆ بەقای بۆنییە
هەرکەسە ئەورۆکە لەسەر چەرخییە    رۆژانی دی خۆی لە بنی چەرخییە
وەختێ کە چەرخت دەگەڵە بووی قەوی    مەشکێنە تا نەشکێ سەرت بێ نەوی
چەرخە وەکوو تۆپە دەسووڕێ مودام    قودرەتی دەشکێنێ سێلاوی خودام
کوانێ ئەمیر حەمزەیی ساحێب قران[٢٧١]    کوانێ سکەندەر کوا ئەمیر ئەرسەلان
کوانێ لە شێرۆیە، لە رۆستەم خەبەر    کوا مەڕ و بزنۆکە، هەیە لێی خەبەر
ئەو هەموو خۆشیانە هەبوو نێوی شار    هیچی نەما ئەورۆ لەسەر یەک قەرار
هەر رۆژەکە وگیرە بە یەکێ دەبێ    تاکوو پلاوی بۆ خەڵک لێ‌بنێ
خەڵکی بەخۆشی لەسەری سفرەیە    کاری بە بێ‌خوێیی و سوێری نییە
حەسرەتە وەختێکی نەخوا کەس پلاو    ئاشپەزە خوێ حاڵییە دەڕوا لەناو
بەند و بەساتی دەبێ خڕکاتەوە    لەززەتی بۆ خەڵکی نییە ئاشی، وە

کوانێ لە حەوت ماڵێ دەهێنن هەویر          بۆقژەی[٢٧٢] منداڵی بچووک بێنە بیر



ساحەبی چوار چاوان[٢٧٣] بڵێ پێم دەوا          دەرمانی شەوتێی نەخۆشی چ با



کێیە لە حەوت دەرکە بدا بۆمناڵ          پێی‌بگرێ[٢٧٤] رێیە بچێ دێرە ساڵ
بینێ مناڵی سەوەتە، وابڵێ          عالەمینە ئەوسەرە هاتۆ بۆپێ
جوابی بدا: ڕەببی خودا پێ‌بدا          دایە بچێ دەرکی دیکە لێ‌بدا



قاعیدە بوو وەختێ کە باغ دێنە بەر[٢٧٥]          بکرێ بەخێر ئەووەڵی بەر، سەربەسەر
بۆیە لە هەووەڵ بەری باغی گوڵان          قازی[٢٧٦] ترێی جوانی دووسێ دا بەمان



وەختێکی منداڵی چکۆڵە دەبوو          گەورە دەبوو ئەمما زبانی نەبوو
ئەووەڵین پارووی دەبوو بغرێنەوە[٢٧٧]          دەسنانی پیاوچاکی زەمانی ئەوە
بیبێن دەنێو زاری عەزیز کۆرپەیان          تا، وەفسە بێت و بکا گەممەیان



لیکی منالانی[٢٧٨] بچووک شیرەخۆر          زۆر کە دەهات دەیکرد لیباسانی بۆر
قاعیدە وابوو کە بە گۆرییەی دەخاڵ          لێیدەن لە ئەو زاری چکۆلەی مناڵ
وەختێکی ئەوکارە بە دڵ هاتە ڕوو          لیکە خەلاس کانێکە ویشک دەبوو



کێ بە لەبەر ترسی منالانی[٢٧٩] جوان / رۆژێ بسوورێنەوە نێو چۆمەکان
تا سەرە قرژاڵی ببینێتەوە / بیهێنێ بیبەستێ لە شانی ئەوە
ترسە خەلاس بێت و نەمێنێ هەرا / ئەورۆ لە ئەو کارە نیشانێ نەما



پشتی دەرک بوو شەوی شەمۆیە[٢٨٠] ژن / گوێ لە قسەی خەڵکی لە کووچەی کەچن
نییەتی خۆی کردبوو گەڵ ئارەزوو / تا چ دەبێ، نەفشە، چ دێنێتە ڕوو
ئایا گرێی کاری دەبێ ئاوەڵە / یانە غەم و دەردی دەچن لەو دڵە
گەر قسە خۆش بایە یەقینی دەبوو / خۆشی دەکرد، مەقسوودە حاسڵ بوو
وەختێکی غەیری ئەوە با، نارەحەت / فیکری ئەوە، ئاوەڵە نایێتە بەخت









گومی دەباخانە کە بەندی دەباخانەی، دیاری دەکا.

## میرمیرێنی سابلاغ[٢٨١]

داشا مەجید بەحری ژیان قووڵە بن — ئەوکەسە نازانن مەلەی قووم دەبن

زۆرە دەنسێو بەحرەکە، ماسیانی وورد — دەخورێن بەدەست جانەوەرانی بەگوڕد

راستی چ ڕازێکە کە دەبخوا قەوی — هەرچی زەعیف بێت و دەگیری کەوی

نازانێ ماسێکی کە زۆر گەورەیە — گەورەتر و گەورە لەسەر وی هەیە

خۆ هەمیشە لاوی میوان نیێ لە گیان — پیری و نەخۆشیشە لە ئینسان میوان

چاکە بپارێزینەوە تەختی ژین — پێشتر لەوەی بەردی لەحەد بێ سەرین

هەرکە بە قودرەت بێ، بە هەیکەل قەوی — مار ومشک زۆرترە میوانی وی

گورگەکە رێی کەوتە دەهۆڵی مەران — تاقە سەرێک نابێ سڵامەت لە گیان

وەختێ بگا شوانی بەڕێز دەرکی هۆڵ — دەکوتێ بە گۆپاڵی قەوی گورگی حۆڵ

دەبکوتێ بۆچی کە مەری خواردووە — چەندە گوناهی بوو، ئەوی کوشتووە

جا دەکوتێ شوانە بە گۆپاڵی چاک — خەڵکی کەساحێب مەرە خۆشحاڵە پاک

مەسئەلەیی ژینە، میسالی وەیە — چەرخە دەهەسنێنێ کە تۆڵەی هەیە

گەرچی خودا داویێ موقام وجێگا — غەررە مەبە گیانی عەزیز رۆژی وا

رۆژێکی دەسێنێ تەبیعەت لە تۆ — داخی هەموو حەسرەتی دۆستانی خۆ

گیانە بەسە خەو، مەکوتە سەر ئەوە — «عاقیبەتت خێر بێ» دەڵێن ژن ئەوە



میرمیرێنی شاری لە سابلاغی خۆش — خەڵکی وەکوو ئاوری، دەهێنانە جۆش

بەکێکی میر، بەکێ وزیر و گزیر[٢٨٢] — دەستووری میری نەدەکەوتن بە ریر

هەرچی کە دەستووری بدا بابە میر — فەوری عەمەل دەکرا بە دەستی وەزیر

قودرەتی هەرکاری هەبوو میری من    ئەبلاکە نایێتن بکا پێکەنین
میرە چلۆن قودرەتی پێ بوو عەتا    هەرچی کە کوتبایەی دەبوو وابا
بەزمی ئەوا نایەتەوە سەر زبان    چۆنی شەرح دەم کەبە چاو بێ عەیان
بەخودا ژیان چاکەیە نە سەرکوتان    کوا خەبەرێک ئەورۆ لە میری چەلان
وەختێکی نیێ، گیانە بەقا بۆ ژیان    بۆچی بەخۆرایی دەکەی سەرکوتان
تەختی فەلەک زۆری ئەوە دیتووە    خەڵکی فریو داوە ئەوی کوشتووە
وابوو فیکر، پیاوێکی چاکە لە ژین    زاهیری زۆر چاک و زبانی ئەمین
رۆژ و دوو روژێکی لەنێو باغی دڵ    بولبولە دەیخوێندن لەسەر دار و چڵ
ئەمماکە بای پاییزە هاتە سەما    عالەمە تێکڕا چوو بە بادی فەنا
چەرخی زەمان ژینی ئەمەش تێک دەدا    زاڵمی ناهێڵێ لە عەرز و حەوا





گومی قاوەخانە، کە زەمانیکی بە گومی عروسان مەشهور بوو.

## راوچێکانی سابلاغ[٢٨٣]

بادێ لە ڕاوچیانی زەمانی قەدیم — حاجی عەلی[٢٨٤]، کاکە قەزاق[٢٨٥] و کەریم[٢٨٦]
کاکە حیجازی[٢٨٧] و خەلیل قەنەکون — قازی[٢٨٨]، دەڵێ مەحموود سمیڵ[٢٨٩] هەرنەبوون
قادری ریحانی[٢٩٠] دەگەڵ ئەردەڵان[٢٩١] — کاک فەقێ ڕەحمانیش[٢٩٢] لەڕیزی ئەوان
وەختێکی نیعمەت[٢٩٣] دەچووڕاوی کەوێ — دەرویش[٢٩٤]وشامی[٢٩٥]وحەسەن[٢٩٦]بوون لەوێ
عالەمی ڕاوچیانە چ بەزمە، خودا — غاڵبە، چۆن، دەکوتێ پەڕەندەی حەوا
عەینی کە بەهرامە کە گۆری دەکوشت — ئاخری کە هەر گۆرە بوو بەهرامی کوشت
زیندەکیە..! هەرکەسە فیکری لەخۆ — هۆشی لە خەڵکی نیێ بەهات و بەچۆ
تا چیە مەنزوور لە ژیان کاکی من — بۆچی دەکێن ئەو هەموو کاری لەعین
خۆ هەمیشە تەختە لە ژیر پێ بە نێ — ڕۆژێکی ئەو تەختە دەژێر پێت دەنێ





گومی پردی تازە کە دە زەمانی خوی دا خەلکی زور خینکاندن.

## قومارباز‌ەکانی سابلاغ

داشا مەجید حەسرەتی دونیای دوون — هەرکەسە جووریکی گرفتاری بوون
بەکێ بەدەستی غەم و فیکری عەیاڵ — ئیدی گرفتاری خەراپی مناڵ
زەحمەتە ئەورۆکە ژیان بۆ فەقیر — کوانێ کەسێک دەردی ئەوی دێنە بیر
هەرکەسە نەقشێک و خەیاڵێکی سەر — تاکوو بەرەی بێنێ لە ئاوێ بەدەر
عومرە زەمانێکی نەتوولانییە — خۆشە کەئالوودە نەکەین سانی بە
ژینە بەتاڵی بە سوێری دەچێ — چاکە بە پیاوی و بە مەردی بچێ



باسی عەلێ شەل[٢٩٧] کە قوماری دەکرد — شۆڕەتی خاریجی ئێرانێشی گرت
پیاوێکی خڕکۆڵە وەلی توند زبان — زیرەک و لەیلاجی[٢٩٨] قومارباز‌ەکان
شەل بوو وەلی ساغ دەگەڵی دەر نەچوو — هەر دەم و ساتێکی لە شارێ دەبوو
قەت نەبوو دەفعێکی بدۆڕێ قومار — ئیللا مەگەر حیلەبەکی بێ لەکار
ئاخری حەریفێکی قەوی هەڵقوولێ — داینا لەسەر عەرزی تەکە بۆ عەلی
بەو هەموو ئوستادی هەزار فێڵی چاک — بردی ژیانی وی بۆ بن‌ژێری خاک



کێیە قەرانێکی ببردێ لەوی — ئەکبەری میاندواوی[٢٩٩] سمێڵ زۆر قەوی
زۆری دەکوت ئەووەی دەڵێم ئەووەیە — خاڵە ڕەشە هەونییە، ئەو سوورەیە
پیاوێکی بێ ماڵ و بەدایم خومار — فاسید و ئینسانێکی زۆر نالەبار
سێ قەرە خاڵی کە بەدەستێوە بوو — بەزمی قومارانی لەوان ساز دەبوو
دوو وەرەقی ڕەش بوو ئەوی دیکە سوور — دایدەنا سەر عەرزی لە بازار و ژوور
هەر وەکوو چاوبەستی بەفێڵ و قومار — سووری دەکرد ڕەش لە خەڵک نابەکار

ئـــــاخری شـــەویک گـــەردنی وی هـــەلبرا ئـــەکـــبەر و خـــالانی ڕەش و ســـــوور نـــەما



خـــــللەخلی ســـاڵە شـــەلم[٣٠٠] هـــاتە بـاد ڕەبـــبی خـــودا رووحـــی ئـەوی خـــۆش بکـاد
ئـــــەسکەملە و بـــانژۆر و شـــێر و خـــەتان کـاکـە غـولام[٣٠١] و محە[٣٠٢] ئۆگـری ئـەوان
ســـنجگەیی کـــاکـــە مـــحە و کـــاغولام بـــــەزمی هــــەبوو رۆژی لەبـــانی حـــــەمام



هــــاشم[٣٠٣] حـــسابی کـــە دزی بـــوو هـــەزار ئـــــاهی خـــەڵک ئـاخری لەتـــی کـــرد بـەجار
گـــــەرچـــی کـــەری واکـس و بـۆیاغ لێـدەدا ئـــــــەممالەزۆر کـــاری کـــەسیف لای دەدا
غـــــیرەتی پـــیاوانـــــی قـــەدیمی هـــەبوو بـــۆشەڕێ یـــەک بـــوو و هـــەزار روو بـــەروو
گـــــەر بـــێتو بـــڕوات بـــە ئـــەوی کـــردبا بـــــاتمانی زێـــــڕت بـــەوی ئـــەسپارد بـــا
وامـــــەکـــــەنە فـــیکرێ کـــــە هـــاشم چ بـــوو ئـەحمەدی مـــەولوودی[٣٠٤] کـە هـاوڕێی هـەبوو
زۆری بـــــە پـــــیاوانـــــە قـــەدەم هـــەڵ هـــێنا هـــــاشمە بـــێکەس بـــوو کـــەوای لێکـــــرا
ئـــــــەحمەدە دوای هـــــاشمی ئـــاوارە بـــوو نـــێوی نـــەما ئـــاوبوو بـــە عـــەرزێوە چـــوو



بـــاسێ لە پـــیاوانـــی ســـەری حـــاڵ و خـــۆش کـــا حـــەمە ســـۆکـوتکەیی[٣٠٥] مـەشروب نۆش
لۆتـــــــیی شــــاری لە زەمــــانی قـــــەدیم بـــاسی خـــــەراپـــەی بـــوو قـــەدیم و نـــەدیم
بـــــەزمی ئـــێوارانـــــی لەنـــێو بـــاغەکـــان گـــــــەڵ حـــــەمەدی مــــاڵە مـــــەلامەولوودان
زۆر دبـــــتنی بـــــوو کـــــە دەبــــوون پـــێکەوە بـــــەزمی ئـــــەوان ئـــــەورۆ لەبـــن خـــاکـــەوە
قـــــەنەکـــێشانی[٣٠٦] حـــەمەدی بـــەزمی بـــوو نـــێو ئـــاوی قـــەنەی هـــەڵوچە و گـــوڵ دەبـــوو
عـــــومرە دەچـــــێ گـــیانە، چ خـــۆش و خـــەراپ حـــــەیفە بـــــەسەرمەستی و هـــــەوایـــی شـــەراب



لێـی بـــوو دوو ســـێ مـــاڵی خـەراپ خـواری شار شـــوکری خـــــودا بـــــەردی بـناغانی خـوار

ئەکەبەرئابادە[٣٠٧] نێوی بوو لەسەر خەڵکی ئەوێ جەنعی هەموو خەڵکی دەر
ئاخری شەماڵێکی بە توندی، قەویماڵی هەموو کردە خەراپ و نەوی



بە ریز کاک حاجی مەلای موسەنین ئەوەلین ددانسازی مەهاباد.

## شێتەکانی سابلاّغ

بادی‌خەیامی[٣٠٨] دەکەم وخدرەشێت[٣٠٩] — دابەسووری[٣١٠]،خاڵەسوورە[٣١١]،خوونچەشێت[٣١٢]

خوونچەشێتم شێتی گەلاّ چایی بوو — هەر لەدەر و کووچە منالّی لە دوو

نێوی مەلەک کوانێ لە کووچانی شار — خات مەلەکە شێتە نەماوە لە کار

ئانیبج و مانیبج[٣١٣] نەماوە لە دەم — ئێمەش وەکوو وی دەکەوینە عەدەم

بیللی‌بیللی، چیکلی‌چیکۆ[٣١٤] چی لێ‌هات — دەرویشی[٣١٥] توونخانە بەکوێدا هەلاّت

سەیدەلووشە[٣١٦] پیاوێ حەرامزادە بوو — دوای دەکەوت رۆژێ منالاّنی کوو

کاکەعەلی شێتە[٣١٧]، خەجیج خوشکی وێ — پێم‌وایە چل‌ساڵە کە چوون بن گڵێ

کاکەسەید[٣١٨] شەقی لە خەڵکی دەدا — کەس نەبوو چارێکی لە شەقی بکا

شەقی لە ئاغا و لە گەورە دەدا — نەک لە فەقیران و هەژاران بدا

سابیرەکەش[٣١٩] دیارنێ لە مەیدانێ‌دا — حەیدەرەباقۆشم[٣٢٠] وجوودی نەما





چووار چرای سابلاغی بەریز، کە ئەورو مەیدانی شارەداری پیدەلین.

## «خەیابانەکانی سابلاغ»[٣٢١]

داشـــــامەجید نـــــیوەشەوان پشـــتی‌بان
تـــــاریک و ئـــــەستێرە لەنـــێو ئـــاسمان

ســــۆزەیی بـــای قـــۆرغێ لەلای تـــاقەدار
دێـــتەوە نـــێو شـــاری بـــەلەنجە و بـــەلار

قـــرەقرری بـــۆقی لەنـــێو چـــۆمەکـــان
زەنگـــانی کـــاروانـــی کـــەنارکێوەکـــان

دەنگـــی مـــنالێکی بـــچووک نـــیوە شـــەو
دەگـــری لەبـــۆ شـــیری و دایکـــی دەخـــەو

نـــیوەشەوە کـــوندە دەخـــوێنی لەبـــان
مـــانگە تـــەماشایە دەکـــا شـــاری جـــوان

بـــەزم و هـــەرای دەنگـــی ســـریلەش لە دوور
نـــــاڵەی فـــەقیرانـــــی نـــەخۆشم لە ژوور

بـــــایە خشـــەی دێـــنێ لە داری حـــەسار
شـــــاخی دەلارێـــــنێتەوە وەک چـــــنار

هـــەرشتە جـــوورێکی دۆعـــای خـــۆدەکـــا
زیکـــــر و تـــەمەننایە بـــە پـــێی‌وی دەکـــا

ئـــــەمنی ئـــەسیرێکی غـــەم و دەردەکـــان
خـــێرە نـــەبوو شـــەررە بـــە پـــێی فـــیلەکـــان



یـــــادی خـــەیابانی قـــەدیمی لە شـــار
جـــۆگـــەلە ئـــاوانـــی دەهـــاتن بـــەجار

فـــەعلە هـــەموو رۆژێ دوو ســـێ دەفـــعەیان
ئـــاوی دەپـــرژانـــدن لەســـەر رێگـــەیان

مـــاشێنی ئـــاوێ[٣٢٢] کـــە بـــە زوو هـــانە شـــار
ئـــاوی دەپـــرژانـــدن خـــەیابانی شـــار

دیـــددیدی زۆرخـــۆشی هـــەبوو مـــاشێنە
نـــەمدیوە تـــا ئـــێستێ لە دەنگـــی وێـــنە

دادوو،دادوو ســـەیدزادە ئـــاوای دەکـــوت
ئـــاوم پـــێیە خـــۆت‌لادە جـــوابـــی دەکـــوت

یـــەک دوو خـــەیابانی هـــەبوو شـــارەکـــە
پـــڕ لەگـــڵ و خـــۆڵ و قـــوڕاو جـــۆگـــەکـــە

یـــەکـــێ لە بـــەرقێوە هـــەتا چـــوارچـــرا[٣٢٣]
ئـــیدی شـــێرو خـــورشید هـــەتا ســـینەما

ئـــەووەڵی شـــاپوور بـــوو،دووەم پـــەهلەوی
چـــۆل بـــوو خـــەیابانی بـــە تـــۆز و نـــەوی

ئـــێستێ خـــەیابانە پـــڕە خـــەڵکی دیـــم
کـــەم کـــەسە بـــی‌ناسم لە خـــەڵکی قـــەدیم

روون دەبـــێ چـــاوانـــم کـــە دەیـــبینمەوە
خـــەڵکی قـــەدیم شـــاری لە ســـابلاغەوە

داب و رەســـم، جـــەمعی گـــۆڕاوە و نـــیشان
خـــەڵکی قـــەدیم شـــاری دەچـــن بـــۆ نـــەمان

هـــــەمسەفەرین پـــێکەوە، مـــاشێنی ژیـــن
ئـــای لە خـــەیابانی بـــە تـــۆز بـــەردەلاَن
ڕۆژێکـــــــی ئـــاڵمانی، ڕۆژیدی عـــرووس
عـــادەت و ڕەســـمیشی نـــەماوە حـــەیف
ڕەســـمی زەمـــانە، دەبـــێ وابـــێتە ســـەر
ڕاســـتی عـــەجەب ڕازە، لە نـــەسلی بـــەشەر
وەخـــتێ ئـــەجەل مـــۆلەتێ نـــادا بـــە مـــە
چـــاوم، بـــرایـــانم، عـــەزیزانـــی گـــیان
بـــــەسە مـــــەنوو، لاوی بـــەرێزی وولاَت

ســـــوورعەتی بـــای گـــرتۆ، بـــە ئـاخری ئـــەوین
هـــەر ڕۆژە ژێـــرناڵی کـــەسێک، پـــاڵەوان
دوای ئـــەوی ئـامریکا بـــەدوایـدا مـــەجووس
هـــەرکەسە جـــوورێکی دەکـــا لێـــیکەیف
شـــارێکی بـــارانـــی غـــەمی کـــەوتە ســـەر
کـــەس نـــەبوو حـــاڵیبێ ژیـــان هـاتەسەر
هـــەرچـــی بکـــەین چـاکـــە، هـــەمیشە کـــەمە
شـــۆقی چـــرای ژیـــنە دەچـــێ بـــۆنەمان
هـــەسنە کـــە تـــا هـــەستێ بـــەتۆ گـــڕ وولاَت





بەردە رەشان دە روژی ۱۳ی ۱۳۳۰، سەفی ئەووەل لە کەنار کلاو سپیکە، نووسەری کتیبەکەیە.

## چرا بەرق[٣٢٤]

ئای!... لە هەراو دەنگی چرابەرقی جوان    وەختی شەوان ڕوونی دەکرد کووچەکان
گەرچی لە دوور دووری مەهابادێ بوو    ڕێگەیی سەرچاوە بەوی ڕوون دەبوو
کاکە موحەمەد بوو شۆرەت تۆکمەچی    مەئمووری وێ، ڕەبی لە دەسمان نەچی
سیمبانی شاری بوو مامە و موستەفا    ئێستێ کە هەر ماون بە لوتفی خودا
شارە بە دەنگێوە شەوێ چەندە خۆش    نەیبوو خەڵک دەرد و پەژاری و پەرۆش
خامۆشی وەختێکی دەکەوتە وولات    دەنگ و هەرای بۆقی لە چۆمی دەهات
بۆنی نەسیمی سەحەری گەڵ بەیان    دەنگی موناجاتێ لە مزگەوتەکان
سەرخۆشی خۆشحاڵی دەبوو، خەڵکی بەو    ئەورۆ هەرا و بەزمە و گرمە لەنێو
سەددێ دەبینن کە قەراغ شاری‌بە    باعیسی لێدانی ئەوی سەعدی[٣٢٥]یە
کاغەزی نووسی بەخەڵک نا لەوێ    سەددی مەهابادێ دەبێ لێدرێ
سەددەکە چوون ساز بوو لەوێ پێشی ئاو    تێک‌چوو و لەوێ پردو دوو حەوزی گراو
ئەورۆ چرا بەرقە لەشاری نەما    کەس‌نێ کە لایلایە بڵێ بۆ سەفا
دەنگی چرابەرفی بەنیوەی شەوێ    خۆش‌بوو بەدەنگی وی خەوت لێکەوێ
خاترەیی زۆرە لەنێو خەڵکی شار    لای پیاوە پیران و ژنانم بەجار
سابلاغە چەن خۆش بوو خەڵک باسەفا    ئەورۆ هەزار فێڵ و فەرەج هاتەلا
هەرکەسە جوورێک دەچێ بۆ پێشەوە    بەڵکی کلاوێکی بنێ سەرئەوە
دوو ڕۆژە ژین، باغی ئەوین بێ‌بەقا    داری عومر سەد لقی بوو، چی نەما
حەیفە هەزار داخە سەفای ئەوەمی    خامۆشە نێو شاری چرای و شەمی
هاتەوە فرمێکە بەدوو چاوەدا    عومرە خەلاس، پەتکی ژیانی پسا

## کارێژدارەکانی سابلاغ[٣٢٦]

داشا مەجید وەختێکی خەرمانی سوور — دێنەبەرێ، زەحمەتی جووتێر و پوور
ساحەبی دڵخۆشە خەلە و خەرمەنی — هاتە بەرێ وەختی غەمێ ڕاپەڕی
قەرزی خەڵک پاکی دەدا تا نەمان — دەکرێ بۆ خزمان و مناڵی شتان
لای سەروو پەیدا دەبێ هەورێکی ڕەش — دابدەگرێ عەرز و دەئاسمانی گەش
هەورە دەبارێنێ چلۆن تەرزە بار — ئەو خەل و خەرمانە لەپڕ دێتە خوار
فوڕ بە سەری کاکی فەلە دادەنێ — ئاوانی سێلاوی دەبا خەرمەنێ
تازە چ چارە هەیە فوونی بڕا — حاسڵی ئەو ساڵە بە سێلاو بڕا
ساڵێکی دیکە کە دەکێڵێ زەوی — حاسڵی ئەو ساڵە بەسەد جوور قەوی
چونکی بەشوکرانە ڕزایدا بە، «لا»[٣٢٧] — تۆڵەبی بۆ کردەوە ئەو چەل خودا



بادی لە کاراژی مەهاباد دەکەم — ساحەبی وی کاکە عەلی ڕەحمەتەم[٣٢٨]
پاک و ئەمین کاکە موحەممەد غەریب[٣٢٩] — منداڵی کارێژێ وەلی، بێ نەسیب
بادی لەکاراژ و لە مامەغەنی[٣٣٠] — یا لە ڕەسوولی کەریمی[٣٣١] و خوسرەوی[٣٣٢]
نێوێ لە گەرمیانی[٣٣٣] لە شاری نی‌یە — کوانێ کوڕیش، نێوی ئەوی بیر هەبە
کاراژی میهەنتوور و لیوان و بەرق — ئیدی ترانزیت بوو، تی‌بی‌تی[٣٣٤] بە لەق
سەید هاشمە[٣٣٥] نێوی نەماوە بەجار — خۆی لەبنی خاکە کوڕانی لەکار



کاکەعەلی‌کوردە[٣٣٦]،ڕەحیم[٣٣٧]،سوارەکوێر[٣٣٨] — یادی میرزامینە[٣٣٩] و عەزیزی[٣٤٠] بە زۆر
سەددیق[٣٤١] و ئیبراهیمە سوورە[٣٤٢] نەمان — ئاسوودە بوون شۆفێر لە دەستی ئەوان
ئەدوورۆ هەرا تاکاکە ماشێن بڕۆ — تەوریز و میاندواو و ڕەزایە بچۆ

«کـــاکـــە بـــدە حـــەققی دەلاّلـــی ئـەمن» «چـەندە بـدەم» «هـەرچـی بـدەی چـاوی مـن»
ئـــارام و ژۆرژیکـــە،یـــاوەر، دەوڵـــەتی[٣٤٣] جـــــەمعی بـــــرابـــانی دەشـــــیمحمەدی
خـــەڵکی بـــە لۆری لە بـۆ ســـەردەشت دەچـــوو هـــــەورازی هـــەڵدێر و بـــڵیندی هـــەبوو



وەستا قادری تکمەچی ئەووەلین میکانیکی سابلاغی.

## شەربەت فرۆشەکانی سابلاغ[٣٤٤]

داشــــا مـــەجید ســـەبزە لە ســـەحرا و دەر
جـــوانـــی دەلارێـــنێ کـزەی بـای ســەحەر

گـــەنمە، کـــە کــەروێشکە دەکـا دەسـتی بـا
عـــەبنی وەکـــوو زولفـــە بـــە دەم بـای ســەبـا

دەنگـــی هـــەویردان وکـــەوی نـــێوی شـاخ
جـــوابـــی دەدا ژێـــری هـــەور قـــازەلاخ

هـــەرکەسە مـــەشغوولی غـــەم و دەردی خـۆ
زرە کـــــەو و زەردە زوڕە کـــــوڕ کـــــوڕۆ

کـــاکـــی فـــەلەئاویّ لە گـــەنمێ دەنـــێ
تـــاکـــوو بگـــاتێ بـــۆ ســەری خـەرمەنێ

«ئـــاوەکـــە هـــێلانە لەمـــن تـــێک دەدا»
بـــانگ و هـــەرا و قـیژە دەکـا کـوڕ کـوڕا

جـــووجکەیی بـــێچارە دەخـــنکێ دەئـــاو
کـــاکـــی فـــەلە بـــێ خەبەرە، دڵ شکـــاو

ئـــەو هـــەموو ئـــاواتـــی گـوڵ و بـولبولە
ئـــەو هـــەموو عـیشقەی بـەگـوڵی سـەرچـڵە

وەخـــتێ بـــە مـــەفسوودی نـیگاری گـەیشت
دەســـتی تـــەبیعەت غـــەمی ســەر دادەڕشت

شـــــەربەتی مـــــێوژە ڕەشـــە نـــێوی بڕا
حـــاجی موحەمەد[٣٤٥] کـــە لە دونـــیا نـــەما

دەنگ و ســـەدای نـایە بـڵێ «یـاکـەر ...یـم»
بـــۆ غـــەم وئـــاواتـــی دڵـــی بـا بـژیم

«ئـــاوی هـــەناراوی یـــە ئـــەو شـــەربەتە»
ئـــەورۆ خـــەڵک جـــەرگ و دڵـــی لەت لەتـە

ئـەووەڵێ سـوفی ئـەحمەدە[٣٤٦] بـوو ڕیش سپی
شـــەربەتی مـــێوژان بـــە پـــەنابادی بـــی

حـاجی ئـەحە ڕەش[٣٤٧] بـوو بـە نـێوی کـرام
شـــەربەتی مـــێوژانـــی نـــەدامـــێ بـەلام

وەخـــتێ کـــوڕی حـاجی مـوحەمەد هـەبوو
نـــێوی کـــەریم شـــەربەتی وی چـــا نـەبوو

فـــڕنی بـــە دۆشـــاوی مـەجیدە قـووباد[٣٤٨]
گـــەورە فـــرانـــێک بـوو چکـۆڵەی پـەناد

کـــاکـــە خـــومایێزی بـــە جـــەمعی بـرا
فـــڕنی ئـــەوان خـــۆش بـوو دە بـازاری دا

قـــاوت و دۆشـــاو[٣٤٩] و دەڵـــەمە و بـەستەنی
بـــەک، بـــەشی زســـتانێ، ئـــیدی هـاوینی

کـاکـە بـرایـمە لەگـە[٣٥٠] و کـاکـە سـوور[٣٥١]
ســـەرداری زســـتانێ دوکـان گـەرم و، ژوور

شـــەربەتی ئـــەو دووانـــە لە مـێوژی تـەواو
ڕەنگـــی وەکـــوو ڕەنگـــی هـەنارانـی سـاو

کـــاکـــە ڕەشـیش[٣٥٢] شـەربەتی شـاری دەدا
کاکە حەسەن شەربەت[٣٥٣] بوو، ئەویشم نەما

ڕاســـتی لە ســیرم چـــووکـــە ســیکەم بـەیان
کـــاک حـــاجی تـاریکە[٣٥٤] لە ڕێـزی ئـەوان

عـــەبلای‌مرۆتێشم[٣٥٥] دەگـــەڵ ســـاڵەکـــە[٣٥٦] مـــــەیدانـــی ئـــارد، جـێی‌بوو لەبـن پـایەکـە







مەنزەرەیک لە مەیدانی وەرزشی کە لە پشتەوەکانی مام قەمبەران دیارە.

## جارچێکانی سابلاغ[٣٥٧]

کاکە ڕەسووڵشاڵی[٣٥٨] و نایبکەریم[٣٥٩] پێکەوە جارکێشی دەشاری قەدیم
داخوا لەکوێ کاکەعەلی[٣٦٠] جاڕ دەکا مزگێنی دێنێ کەری وون بوو بدا
«کێ کەرێکی دیوە لەنێو کووچەکان» «دوونمەنی مزگێنی دەدەم من بەگیان»
عادەتەکە وایە لە دوای مردووان فاتیحە یەک هەدیە بکەین بۆ ئەوان



## دەست فرۆشەکانی سابلاغ[٣٦١]

داشامەجید دەرد و غەمی ژینی پار ئەسرینی چاوانی هەتیوی هەژار
ئاخ و بڵێسەی نەفەسی دایکەکان دەربە دەری زەلزەلە لێدراوەکان
شەرم و شکۆی مێردی فەقیر پێشی ژن کۆڕپە لە دەست چوویی لە دونیایی ژین
دەرد و غەمی قەیرەکچی بێ جەیاز پووڵی نەبێ بابی، بیکا بێ نیاز
گەردنی خوار بوویی فەقیر ساڵی نوێ نەبێ لیباسێک و جووتێک کەوشی نوێ
ئاورێکی زۆر گەرمە بڵێسەی بەتین ڕۆژێ دەسووتێنێ هەموو کاخی ژین



شۆرمەزەی ڕەحمانە چکۆڵ[٣٦٢]،خوشکەفات[٣٦٣] بۆنی لە نێو شاری دەهات تاوهەڵات
کوانێ...؟ کە هاوارێ بکا شۆرمەزە ئەورۆ عەجەب خۆش وبەتام و مەزە
نۆکی عەبەش نابێ فەرامۆش بکەین کاکە عەبەکوێرەیە[٣٦٤] مەشهووری کەین



بەستەنی ڕەحمانی[٣٦٥] لەکووچانی شار «شیر و شەکەر بەستەنی» دەیکرد جاڕ
دەنگ و سەدای نایە دەبن قەبرەدا «شیری بەهار بەستەنی» نێوی برا

کـــاك هـــاشم ئـــەو تـــۆوە بـــەعەینی بـــەڕوو ئـــەی نـــاخۆمیی خـــەڵکی بـــەوی شـــۆخی بـــوو
جـــوابـــی دەدا «نـــاخۆی...» کـــە نـــەی لێم ســـەڵاح بـــا تـــۆوی‌سوێر نـــێوی نـــەمێنی، ســـەڵاح



کـــاکهـــاشم:[٣٦٦] «کـــێ مـــاڵی خـــەرازی دەوێ» زســـتان و پـــاییزە هـــەرای بـــوو لەوێ
پـــیاوێکی خـــڕکۆڵە بـــە ئـــەخەلاقی چـــاك ســـاف و دورست، ســـالم و ڕەفـــتاری پـــاك



کـــاکـــە گـــون هـــەنبانە[٣٦٧] کـــووتاڵی بـــە دەست ئـــەورۆ لەبـــن خـــاکـــە بـــە مـــیترو مـــقەست
مـــاڵی بـــەزازیشـــم ســـەدای لـــێبرا زۆرن قـــەدیمی کـــە نـــیشانیان نـــەما



هـــەرشت و ئـــەسبابێکی لازم بـــبا ئـــەوشنە ئـــیحتیاج و لەبـــازار نـــەبا
لای‌حاجی‌تاریک[٣٦٨] وسەعید[٣٦٩]،کاک‌حەسەن[٣٧٠] حـــەتمەن دوو ســـێ نـــەوعی دەکـــردن پـــەسەن
مـــەخزەنی ئـــەسبابی شـــتی کـــۆنە بـــوون هـــەرچـــی نـــەبووبایە لەلای وان دەبـــوون
ئـــەورۆ لە ئـــەو ســـێیە نـــیشانێک نـــەما خـــاکـــی ئـــەوانـــیشم بـــە خـــانوو کـــرا



## چاروێدارەکانی سابلاغ[٢٧١]

داشـــــامەجید هــــەوری ڕەشت هـــاتەسەر
ناگــری لە دۆســـتانی قـــەدیمت خـەبەر

دەڕژێـــنێ بـــارانــــی هــــەور سـەر بـەخۆ
ئــاوی دەپـــڕژێنێ لەشـــارکـــۆ بـەکۆ

خــــانوو لە زۆر مــاڵی خـەڵك بـوو خـەراب
ئــاوانــــی سێلاوی تـۆ نـەبوو و حـیساب

نێو و سـەری کـووچە دێ فوڕ، ئاوی سوور
پـیسی دەکـــاکـووچەیی جوانـی بلوور

هــەورە ڕەشـە گـەرچـی بـەتێژ دەگـوزەرێ
چـەتری دەبــێ بگــرین کـە ئـەو ڕابـرێ

عــومری بـــەشەر مـانگی بـەهارە عـەزیز
دەگــــوزەرێ مـــەمگێڕە بـــەئینسانی حـیز

ســـــیدق و ســـەفا بـــێتو بـمێنێ لە دوا
چـــاکـــترە ســـەدکــــاخم لە زێـری هـەبا



کــــێ بەکا یـــادی بـــرای چـــاروێدار
بـەو شـــەوی پـــاییز و بـــە ڕۆژی بـــەهار

بــــاری بـــە ئـــەسپان و بـــەبارگین وکـــەر
یـــەکســـەرە بـــۆ شـــاری دەهـێنا نـەسەر

وەخـــتێ قـــەتاری حـــەمە خـیخی دەهـات
شــــــاری وەجــــۆللانە دەخست و وولات

بـــــادێ لە ســــەدیقی قـــەدارەی بکـــەم
بـــارکێشی شــاری بـوو کـە باسی دەکـەم

حــاجی فـەتە پـیاوی سـەری حـاڵ و خـۆش
دەنگـــی قـــەتاری بـــە شـەوان پـڕخرۆش

کــاک حـــوسێنی ڕۆستەمە چـەپەی لەشـار
کــوا ئـــەسەری مـــاوە لە دەنگـــی قـەتار

کــاکــە ڕەســـووڵ عـەبنی حـوسێنی بـرای
زەنگــــی قـــەتارانـــــی نـــەماوە وهــــەرای

نـــــیوەشەوە مــــانگە لە گـــۆشەی حـــەوا
خــــامۆشە ســــابلاغم‌بە ســـەد مــاجەرا

هــــاواری کــــاروانـــــی قـــەدیم دێ خـەیاڵ
شـــــــەقەی نـــــاڵ و ســـمی بــارگینەتاڵ

مـــانگە دەچـــێ، ژێـــر پـەڵە هـەوری لەغـەم
ژیـــــنە وەفــــــای وایــــە، چزۆر و چکـــەم

ئـــەورۆ لە جـــێی هـــاتنی کــاروانــی جـوان
گــــــرمەیی مـــــاشێنە لەنــــێو شـــارمان



## رێدارخانەکانی سابلاغ(٣٧٣)

چوار تەرەفی شاری رێدارخانە بوو — جێگەی عەواریز و جەوازچییانە بوو
جێی یەکێ ژوور شاری لەرێی گومبەزان — ئیدی لەلای خواری قەراغ چۆمەکان
سێیەمی زۆر خوارێ کە دوور بوو لە شار — جێی وی لەکن باغەکی مبللەت قەرار
چوارەمی لای تەسبینە بوو جێی قەرار — ئەورۆ نەماوە ئەسەری هاتەخوار



دەستەیەکی دیکە لە فیتبالیستەکانی سابلاغ. کە لە دوور ئاشەکان دیارن، العان ئەو جیگایە پشتی حەمامی زەندە.

## هەڵپەڕینەکانی سابلاغ

هەڵپەڕین، سێ جوور بوو لە نێو شارەکە
سێ چکەیی، سێ پێیی دەگەڵ ڕۆینەکە
ئێستێ بە تەقلید لەکەسانی دیکە
زۆرە لە ئەنواعی لە نێو خەڵکەکە
چاولێکەری چاکە لە عیلم و لە زان
نەک شتی بێ مەعنا عەزیز لاوەکان
دەرمانە، گەر ئێشی نەباتن لە گیان
بێ ئەسەرە خوو بە ئەوی، بۆژیان
دارێکی بێبەر ئەگەریش جوان نەبێ
هەر ئیدەخۆ چاکە بە ریشی نەبێ



هەڵپەڕینەکانی سابلاغ. زەماوەندی کاک حسن معروفی‌کیا.

## تەپکەدانانی مناڵەکانی سابلاغ[٣٧٣]

چەندە لە بەستێنێ کە ئەلعان نەما	چۆلەکە و چوررە بە تەپکەی گرا
جا مەگەر ئەسپێکی کە کلکی هەبا	دەکرا کە تاوێکی کەسێک لای نەبا
کلکی ئەسب، پاکی هەموو دەردەهات	دەکرا بە تەپکانی کە داندرێ وولات
گۆشەیی بەستێنە بە زستانی سارد	یا نە بە وەختێکی کرێوە دەهات
هەرکەسە تەپکێکی بە دەستی لەوێ	تا بگرێ قاژوو و کۆتر و کەوێ
دەنگ و هەرای «قاژوو بە تەبکێوە بوو»	یا کۆترە گۆشەیی تەبکەی دەبوو
نایەتەوە شەرحی ئەوی بۆ زەبان	بەزم و هەرا و لەرزە و شەقەی ددان
فیکر و خەیاڵ و غەم و دەردێک نەبوو	رۆژێ دڵی خەڵکی بەوەی خۆش دەبوو
هەر بە دەزوو و گەنمە مراوی گرا	گۆمە سەهۆڵ بوو سەری، داعبا نەما





تق‌تقە بەردەکانی گراو سالی ٢٨.

## میعمار و بەنناکانی سابلاغ[٣٧٤]

داشا مەجید یادێ لەکوێستانی جوان
بەفرە دەبێتە بە ڕنوو نیوگەلان
گیانی بە سەرماو سەهۆڵانی وێ
ڕۆژێ دەگەڵ ڕۆژێ سەختتر دەبێ
گەورە دەبێ بەفر و ڕنوو نیو گەلێ
کارگ و کوورادە وگوڵی ژێر پێ دەنێ
گەرچی دوو سێ مانگە عومر، تا بەهار
ئەمما دووسەد ساڵە لەکن ژێرەبار
هاواری ناگاتە کەسێک تا بڵێ
«یەکێ بەهاوارم بگاتن چەلێ»
وەخت و ئەیامێکی بە غەم دەگوزەرێ
کارگە هەتا ڕۆژێ بچێ بۆدەرێ
عاقیبەتی، وەختێ کە بای وەعدە هات
بەفری لەسەر کارگ و کەما لادەبات
ئاڵەکۆکەی پرچنە دێنە دەرێ
بەفرە، کە چۆرچۆرەی دەگاتە بنێ[٣٧٥]
هیچ ئەسەرێک نایەڵێ بای وەعدەکە
شاخ و تەلان، دار و دەر و بەردەکە
نەقشی تەبیعەت ئەسەری خۆی دەکا
زاڵمی سەرشانی ئەسیر لادەبا



عەبلای شەوکەت[٣٧٦] بوو کە میعماری شار
بادی مەلا شێخێ و ڕەحمان[٣٧٧] هەزار
وەستا موحەمەدئەمینەی[٣٧٨] پیاوی چاک
کوانێ بڵێ نیمەبدە خشتی چاک
قادرە ڕەشە، قەڵس و وەلی کاری جوان
ئووستادی بەردان بوو لە دیوارەکان
وەستا موحەمەد ڕەحیمە زۆر حەلیم
کاری بە ئارامی دەکرد و سەلیم
وەستا خەلیل[٣٧٩]، وەستا فەتاح و مەناف[٣٨٠]
وەستا حەمەمینی قەڵس[٣٨١] بێتەناف
ئەورۆکە، هەرماوە لە نەقشی ئەوان
یەک بەکە خانوانی کە ماون لەوان
خشتە، نە پێش‌کار و نە پشت‌کارەما
خام و قوڕ و جۆشە لەبن لابرا
کوانێ دەسوون خشتی لەبەرنەقشی‌جوان
نەقش و نیگاری بێ هەموو لێوی بان
کەس‌نێ قەبووڵی بێ ئەوانە چبوون
گەرچی هەزار دەرزی بەگاسن نەبوون
نەقشە، کە گۆڕاوە زەمانیش ئەوا
خەڵکی شەرە مۆدێ بە خانوو دەکا

## کورەخانەکانی سابڵاغ[۳۸۲]

کوورەیی خشتی بوو سوورە[۳۸۳] و فاتیحی[۳۸۴] پشتی گڕاو میرزا وەهابم[۳۸۵] دەدی
کوورەیی سەید جامی[۳۸۶] لەئەولای پرد بەرقەدی شاخی بوو لەسەر لێوی گرد
کوورەیەکی دیکە لەپشت گومبەزان ئێستێ لەلام وایە نەماوە مەکان
کوورەیی مامقادری[۳۸۷] لەکوچانی شوان ئەورۆکە وێرانە، ئەسەر نێ و نیشان
رۆژێکی زۆر دوورنیێ عەزیزانی من نیوی لە دونیایە هەبێ شاری من
ئەو دەمی یادێکی لە قەبرم بکەن فاتیحەیەک هەدیەی ڕووحم بکەن
گەرچی ئەمن نەمدی سەفای وولات شادێ بکەم رۆژە لە مەغرب هەڵات
جێیەتی گەر خۆش‌بن گوڵی باغەکان هاتوونە بەر، بوونەوە دارانی جوان
هەستە بەلەززەت بخۆ، میوەی لەدار دونیا عەوەز بۆتەوە، سەرتا بەخوار





شەقامی شمزینانی روژهەلات وەختی لیدانی.

## میوەکانی سابڵاغ[٣٨٨]

داشامەجید خەڵکی دەخۆشم خووری / دەبکوتێ هەرکەس کە وەسەر وی کەوی
ئەمما خووری فەرقی دەگەڵ لۆکە یە / خۆی خووری گەرما و بڵێسەی هەیە
دەستانی هەلاجی لەیەک نادرێ / بەندی لەنێو بەندی لەیەک نارەوێ
گەر بەدووسەد ساڵە ببێتن دۆشەک / دەر دەکەوی مووی لە قەراغی بەتەک
خۆی ئەوە لیباسی مەڕی کێوی یە / لۆکە نییە شین بێ لەسەر عەرزی یە
خەڵکی لەوی ڕانک و چۆغەی سازدەکا / هاوین و زستانێ دەبەر خۆی دەکا
هاوینێ فێنکە، بۆ هەوای ساردە گەرم / هەم ڕەق و هەم سەختە، وەکوو لۆکە نەرم
هەرکەسە نەیناسێ شتی چاکی وا / بانە لەسەر حەددی دەخۆ لابدا
ئاوری بەتینێکە دەسووتێ بەخام / ئاوری دەداگیان و سەری وەسەلام



ئای لەترێی ساحێبی‌ی[٣٨٩] قووم‌قەلا / باغی ئیندرقاشی لەوی جێ نەما
هەرچی بڵێی نەوعی ترێیان هەبوو / یەک‌سێ بە دووقرانی، بەیانانی زوو
سەر سەوەنە ڕێزی دەکرد باغەوان / ساحێبی و مایەمێو[٣٩٠] و عەسکەران[٣٩١]
کشمیشی[٣٩٢]، ڕیش‌بابا[٣٩٣]، حوسێنی[٣٩٤] عەزیز / دەستەچن، مێلاقی، گەزەنگێ کە ڕیز
تولخی[٣٩٥] و ترێ ڕەش[٣٩٦] کە هەبوو سێ قران / قیمەتی گوڵمازوو[٣٩٧]، سووراویش لەوان
بادی خەلیلی، کە دەهات پێش ترێ / لەگەڵ‌گە دەێخوارد و دەبوو هەڵفڕێ
کێیە خەلیلێکە کە ئەورۆ بخوا / بادی لەوی و باغی دەگوێزێ نەکا



حاجی حەمەکەولە[٣٩٨] و حاجی ڕەشید[٣٩٩] / کاکە عەلی کەی سەلەمە[٤٠٠] هەرژێد

کـــاک قـــەرەقشلاغی[٤٠١]، ســـمایل عەجەم[٤٠٢]    بـــارفرۆشی شـــاری بـــەزۆر و بـــەکـــەم
عـــەللافی گـــەنمی کـــە هـــەبوو ســـەیدمەلا[٤٠٣]    وەخت و ئـــــەبامێکە لەدونـــــیا نـــــەما
عـــەللافی ئـــاردی حـــاجی رەحـــمانە رەش[٤٠٤]    عـــەبلای وەزیـــری[٤٠٥] بـــوو کـــە هـــەرماوە گـەش
کاکە حەمەشەل[٤٠٦] بوو کەبابچی و هـەباس[٤٠٧]    مـــەشهووری ئـــێرانـــێ کـــەبابیان بـــەباس
بـــادێ لەئـــەو جـــەرگەکـــە چـــواری قـــران    کـــــووچە و بـــازاری هـــەموو پـــڕلەوان
شـــبشی کـــەبابیشم یـــەکـــی یـــەک قـــران    گـــۆشتی مـــەڕی بـــوو نـــەک کـــەڵ و گـــایەکـان
کاکەنەبی[٤٠٨]،کاکەحوسێن[٤٠٩]،کاک جەلال[٤١٠]    جـــەرگانی نـــاسکیان دەفـــرۆشت جـــەمعی ســـاڵ
هـــێلکەی خـــۆمان کـــە لە دێـــڕا دەهـــات    ســـێزدە بـــە دەقـــرانـــی هـــەبوو پـــڕووڵات
مـــاسنی مـــەڕەکـــوێری نـــەماوە لەبـــاد    حـــەیفەکـــە تـــۆراغـــی ئـــەوی چـــوو لەبـــاد
دۆی نـــێوی دۆدانـــە بـــە ســـێ قرانـــی، خـــەست    ئـــەوبەشی یـــەک هـــەفتە پـــڕی ڕۆن و خـــەست
چـــوارشـــیشە جـــەرگیان بـــە قـــرانێک دەدا    ئـــەورۆکـــە دووســـەد تـــمەنە چـــواری وا





گومی پردی سوور دەسالی ٣٨دا، کە ریگای ماشینی رزایە لە پشتی یەوە دیاری دەکا.

## یادێک لە پیاوچاکێکی شار

حاجی ڕەحیم‌زادە[٤١١] یەکەی خێرخودا — جێژنانە بۆ ماڵە فەقیران پەنا
ڕۆن و برینجی بۆ فەقیران دەنارد — تاکوو ببن جێژنێ لەنێو ماڵە شاد
یادی بەخێر یادی لەنێو شارەما — چاکە چلۆن وون دەبێ گیانی برا
بیستوومە ئیبراهیمە ڕێی وی دەچێ — چەن‌خۆشە ڕێی بابی بەڕێز وون نەبێ
جێژنە وەکوو ساڵی قەدیمی نەما — تێک‌چوو هەموو ڕەسمە و ئاکاری وا
حەیفە کەئەو ڕەسمە ئەوای هاتەسەر — خەڵکی فەرق ناکا دەنێو خێر و شەڕ
چابوو فەقیری گەڕەکێ جێژنەکان — دەبدی لەنێو ماڵەخۆ جیرانەکان
ڕەسمی قەدیم بێننەوە سابلاغی جوان — کۆنەپەرەستم پێ‌مەڵێ کاکەگیان!





بەریز حاجی محمد امین رحیم زادە یەکیک لە پیاو چاکانی شار.

## شتە قەدیمەکانی سابڵاغ[۴۱۲] «۱»

داشــا مــەجید عــەبنی مــناڵی بـچووک زۆرم دەدڵ دایــــە فســە نــایە جــووک
دایــە وەهــای بــەستووم لەلانکــێ بــەفەو نـەدرێ تـەکـان دەست و سـەرم، بـچمە خـەو
وەخــــتێکی هـــاواریّ لەبـــرسان دەکــــەم لانکـــێ دەلارێـــنێ کـــە وززەی نـــەکـەم
«بـــەسە مـــەکـە دەنگـێ ئـەتۆ رۆڵـەگـیان» «وەخت و زەمـــانی نـێ بـدەی لێـو تـەکـان»
«بــۆیە سـەرو دەســتت دەبــەستم ئـەوا» مـــــەززەیی ئـــازادی نــەزانــی چ‌بـــا»
«شـــیرێکی دەیـــدەم بـــەتۆ وەک شـیرەیە» «تـــاکـــوو غـەم و دەردێ نـەزانـی چــییە»
«هـــەرکەسە زۆر فـــەهم و شـعووری هـەبێ» «ژیـــنی زەمـــان بـــۆوی بـــەسەختی دەبـێ»
«هـــەرگوڵە ژێـر خـاکـێ دەکـێشێ سـەرێ» «دەورو بـــەری دەگـــرێ دڕوو بـــۆ شـەڕێ»
«تـــاگـــوڵە پـــەرپەر دەبـێ کـاکـی دڕوو» «کـــێشکە لە دەورەی کـــەنەدا بـــۆن و بـوو»
«چـــاوی لە لارێـــنی، لەبـــۆنی وی‌بـــە» «تـــاکـــور نـــەدا بـــۆنی بـۆلای ئـیدی‌یە»
«ئـــەمما نـــەسیمی ســەحەری و بــای بــەهار» «کـــارانـــی خـۆی‌کـردۆ نـەبێ شـەرمەسار»
«ڕەســــمی تـــەبیعیە لە دونــیای فـــان» «ڕۆژەکـــە هـــەرنابێ لەبـــن هـــەورەکـان»
«بــۆچی نـــەبین رۆژە، بـدەین شـۆفی خـۆ» پـــێشی ئـــەوەی هـــەستێ لە دوو بـــابەڕۆ»
«کـــوردە دەڵـــێ: نـــامێنێ ئـــاخری ئـەوە بـــەرخــــە هـــەنا ئـــاخری ژێـری سـەوە»



مـەیدانـی ئـاسینگەر[۴۱۳] و ئـاردی[۴۱۴] نـەما نـــــانکەر و ئـــاوکێشیش لە شـــاری بــڕا
وەخـــــتێکی تـــەندووره نـــەما و نـــان‌کران پشکـــــەڵ و تـــەپیاڵە، دەوە، هـــەڵ‌گـــران
چـــاڵووک و گـــوێنێ و کـــوڵوو چـــی‌نەما نـــانەوەخانە بـــــۆ غــــەمان دانـــدرا
نـیوپووت[۴۱۵] و بـاتمان و دووسێ و سێ‌خەڵاس حــــەودرەم و ســـێ‌درەم لە تـــەرازوو نـــەباس
بـــــرویش و پـــــڕپۆڵە و تـــڕخێنەکـــان شـــــۆرباوی هـــێلکان و لەپـــانی دەجـــوان
مــــاشێنە، نـــــیسکێنە بـــەداری بـــەنە ڕۆنـــەکــە حـەیوانـی، نـەدەرمان گـەنە[۴۱۶]

دیزە ڕەشیش گۆشەیی کوچک ئاوری
دیار نێ دەگەڵ سۆبەگڵی شێوکری

کورسی ئەما خاکە و سەلکە ڕەژی
ژووری گەرم کا تاکوو زستان ببی

کوانێ لەماشە و لەسێپا و مەنقەڵی
یەک خەبەرم داتێ هەیە ماڵەوی

حەوجۆشە ڕەش کوانێ لەناو ئاورێ
نێوکە کەوت فەوری بەوی بێنمەجێ

کێ دەچنێ ئەورۆ لە قەڕتاڵەکان
یا سەوەتە یا سەلە بۆ پلاوەکان

لێفەی کورسی پڕی مۆریانی زۆر
چابوو هەمووی کوشتن نەبات ڕۆنەبۆر

بەختی کچان ناڵێ شەمۆڵەی ژنان
پشت‌دەر و دەروازەکە، گوێ بێ لەوان

زینەتی کوا ماوە لەدیواری ژوور
جوانە سپەندەر[417] کەبڕازێ بەجوور

بۆریا و حەسیریش لەوەتاغێ نەمان
وەختێکی ئاورگە لەژوور هەڵگران

کەندووی ئاردیشم نەماوە لەماڵ
جێی دەگری ماڵە بەتاڵ و حەتاڵ

دەرکە و دەروازە وەکوو خۆنەما
سەردەر و گوڵەش لەسەری هەڵگرا

پەنجەرە، ڕەنگ ڕەنگ و قەدیمی لەماڵ
سوور و بنەوش، زەرد و دەئابی و ئاڵ

کوا خەبەرێک لەو هەموو ئاسارەما
کەس‌نێ کە بمداتێ خەبەر بۆ ئەما

هیچ نەبوو نەفتی بوێ غەیری چرا
ئەورۆ نەفت دەردی گرانە و بەلا

دەستەنوێنە لاچوو لەنێوی وەتاغ
جاجمەنوێن کەم بوو لەنێو سابلاغ

جێی باوەشێن پەنکە و کۆلێر هەیە
فێنکی وەتاغ عەبنی قەدیمی نییە

وەختێ بەرق هاتەوە شاری، نەما
لالە لە نێو ماڵێ، چرای بۆ سەفا

بەروانکەکەی کۆڕپە منالی بچووک
کوانێ دەببنی، شتی‌وا بۆنە سووک

بەرلیکە و کۆچکە بەدەوری مناڵ
دەوری زەمان کردی حەباڵەی بەتاڵ

لانکە، لەکەم ماڵێ هەیە ڕابژێ
بلوێر و دەسرازە و میزدانی بێ

کێیە دروومانێ بەدەستی بکا
ئەنگوستیلەی جوانی دروومان ئەما

کوانێ هەیە ماڵوو، مووررووی باژەڵە[418]
تاکوو خەلاس بێ بۆقژەی بەچکەلە

ئاساری مووررووی شەوەشم[419] بوو خەلاس
قەد نییە ئەورۆکە لەوی بێتە باس

کووژەکە، سەرشانی منالان نییە
تاچاو و زارە نەبێ لێ کاریبە

ڕەوڕەوەش، ئاساری لەلامان نەما
منداڵە پێدەگری، بەرێدا ببا

مـــوورو شـینەش پـێش چـاووزاری دەگـرت
ئـــەورۆ بـە ئـەوکار، دەڵـێن فـیکری کـورت

## ئاڵ و شەوە[٤٢٠]

ئـــــاڵۆشەوە زیـــــدی زەیـــــتانەکـــان
مـــنداڵـــی زۆر خـــەڵکی بـەدەستیان نـەمان

کـــــێیە لەیـــــادیچێ ژنـــانی قـــەدیم
ئـــــاڵوشەوە دەردی گـــرانـــی کـــەدیم

تـــاچلله چـــووبابە تـــرس بـــوو لەکـــار
ئـــاڵە نـــەبا جـــوانـــە گـــوڵی یـــادگار

دەڕزی و دەڕزیـــــلە لەســـــینگی مـــناڵ
لێـــدەدرا تـــاکـــوو نـــەچێ دەستی ئـاڵ

ئـــاڵە عـــەجەب تـــرسی هـــەبوو بـۆ ژنـان
وەخــــــتی زەیـــــتانی و مـــنداڵـــی زان

هـــەرکەسە جـــوورێکی دەکـــوت داستان
گـــرتوویە ئـــاڵ و شـــەوە بـــابی فـــلان...

دەڕزی لەوی داوە فـــــەرار بـــــەبنی وان
کـــاری بـــە خـــزمانی نـــەبێ نـێو ژیـان

ئـــاڵە بـــەسەد نـــەوع و شکـــڵ دێـــتەدەر
گـــــا، ژنـــە، پـــیرێژنە، تـــرسی لەبـــەر

ئـــــەمما لەدەرزی و لەچـــــەقۆ و ئـــاسنێ
تـــرسی هـــەیە نـــاگـــرێ قـــەراری کـنێ

بـــۆیە کـــە مـــنداڵـــە لە داێکـــی کـــە بـوو
دەڕزی و مـــــووروویی شـــەوەیان لێـــدروو

گـــەرچـــی لەپـــێش ئـێوە ئـەوەنێ قـەبووڵ
ئـــاڵە لەشـــاری بـــۆ ژنـــان عـــەینی غـــوول

ئـــــێستێ نـــــەماوە خـــــەبەری وا لەشـــار
بـــــۆ ژنـــــەزاوانـــم تـــرس‌بێ لەکـــار

## دێوەزمە[٤٢١] ـ حووجی بنی حەللەق

زۆربـــــــان دەگـــێڕاوە زەمـــانی قـــەدیم
ژێـــری لێـــغە و کـــورسی کـەسانی کـەدیم

بـــاسی دێـــوەزمەی کـــە ڕێگـابەیی دەگـرت
یـا حـووجی حـەللەق کـە درێژ بوو و کورت

«پشـــتی فـــلانی... لەت و پـــەت کـــردووە»
«ڕێـــــی لە فـــلانی... و فـــلان... گـــرتووە»

دێـــوەزمە گـــەر حـــووجی بـــنی حـەللەقە
ئـــەورۆ نـــەما چـــونکی ئـــەساسی لەقـــە

خـــانوو بـــناغەی بـــێت و مـــوحکەم نـەبێ
خشـــتێکی زێـــڕ بـــێ و ئـــیدی زێـو بـێ

چـــونکی ئـــەساسی لە ســـەری هـیچە سـاز
تـــێکدەچێ نـــامێنێ هـــەرای نـــێو و نـــاز

پـــــەندە، مـــیساله لەقـــەدیمی زەمـــان
چـــەرخـە بـدا سـووڕێ بـە خـەڵکی زەمـان

حـــووجە ئـەگـەر گـەورە بـوو ئـەورۆ نـەما
نـــامێنێ هـــیچ‌کەس لەســـەری تـــەختی ژا

بۆیە کە چاک نێ بەغەم و دەردی زۆر     ژینە بکەین تاڵ و سەری بابە شۆڕ
بەوهەموو ترسە و لەتوپەت کردنی     حووجە شکا، دەستی زەمان گەردنی
بۆیە کە نابێتن بنازی بەخۆ     ئەورۆ سەری تەخت و موقامی ئەتۆ
زۆری ئەوا هاتوونە خوارێ لە تەخت     ژینی بەدەستی تەبیعەت بۆتە سەخت
ئاوێنەی مێژوو ئەوەی زۆر لەنێو     تووند بووە ئەنواری بەئاکاری دێو
ژێر پێ و چەکمانی کەڵە پیاوی نێر     وورد بووە ئێسکانی بەکەڵپانی شێر
تاکوو هەڵستاون بەهاواری وی     فوودرەتی ڕووخاوە بەلاوی قەوی

## کڵاوی سەخرە جندی[٤٢٢]

کێیە بکا باسی لە نێو شارمان     تا بێنەوە یادی عەزیزانمان
سەخرە جنە و باسی کڵاوی لە شار     بەزمی چ بوو پێشی جەوانانی شار
چۆن بچێ ڕێ بگرێ کەسێ بۆ کڵاو     چۆنی بە دەست بێنێ نەبێ سەرشکاو
ئێستێ کەسێک ناکا لە ئەو بەزمە یاد     تازە کە هات کۆنە دەباتن لە یاد

## سوورەی جندۆکان

کەس نێ بخوێنێتن، قُلْ اُوحِیَ     جەغزی بکێشێ بە هەموو دەوریە
بێ ترس ئەو سوورە بخوێنێ تەواو     قوودرەنی زۆر بێ لە دڵ و غەم بڵاو
گەر دوو هەزار دێو و درنج بێنە پێش     یا نە دووسەد شێر و پڵینگ بێنە هێرش
دەستی نەکێشی لە ئیرادە و لە وان     تا بێنە ژێر دەست، شاهی جندۆکەکان
ئەودەم تەڵەب کاتن لە ماڵ و ئەوین     ئاواتی جێ بێتن لە دونیای ژین

## «شتە قەدیمەکانی سابلاغ «٢»»

داشـــــامەجید فـــەسڵی بـــەهار هـــاتەبەر
دەیکـــا لیـــباسی نـــوێ تـــەبیعەت دەبـــەر

دار و درەخت، گـــــیا و گـــژ و کـــۆلکەدار
جـــــەمعی ژیـــانێکی لەنـــوێ دیـــننەبار

بـــەفر و ســـەهۆڵ حـــوکمی نـــەماوە لەبـــەر
تـــــرسان و لەرزیـــــنی هــــەبێ بـــۆبەشەر

دەڕوا لەوەی واوە هــــــەوا بـــــۆخۆشی
نـــابێ غـــەم و دەرد و بـــەلاّ و ســـەرئێشی

فـــەسڵی نـــەماکـــاکـــی فـــەلێ ســـەرچـــنار
دەستـکـــا بـــەقیژان و هـــەرا و قـــاڕەقاڕ

بـــولبولی خـــۆش دەنگـــە دەخـــوێنێ لەوێ
شـــــــەشپەڕ و شـــــللێر و هــــەلاّڵەی دەوێ

هــــەرکەسە وەخـــتێکی لەســـەر تـــەختییە
چـــەرخـــە دەگـــەڵ وی‌یـــە، لەخـــۆش‌بەختی‌یە

وەخـــتێکی بـــای وەعـــدە بکـــێشێ ســـەرێ
کـــوا ئـــەسەری دێـــڵێ لەتـــەخت و بـــەرێ

ئـــــەمما بـــەشەر زاڵـــمە تـــەنێ نـــەبوو
لەو هـــەموو نـــەقشەی کـــەدەڕۆن زوو بـــە زوو

وەخـــــتێکی قـــــودرەت بـــــەسەریدا ڕژا
خـــۆ و خـــودا و خـــەڵکی فـــرامـــۆش دەکـــا

مـــێشەیی کـــوردانی[٤٢٣] وەکـــوو ئـــەووەڵێ
داری نـــــــەماوە کـــــــەبڵێن مـــــێشەبێ

کـــەڵکەکـــی بـــەگزادە[٤٢٤] نـــەوی بـــوو نـــەما
هـــەرچـــی بـــڵیند کـــردەوە خـــۆی، داتـــەپا

چـــاکـ‌نـــێ ســـەری بـــەرزێ لە ئـــاسمان بـدەبن
خـــۆ لە هـــەموو عـــالەمێ زیـــاتر بکـــەبن

بــــۆیە تـــەبیعەت بـــە گـــۆپاڵی قـــەوی
زۆری چـــــــناری بـــــەقەفی کـــرد نـــەوی

وەڵـــــلا هـــەموو تـــەجرەبەیە گـــەورەکـــان
غـــەررە مـــەبن ئـــەورۆ بـــەجێ و مـــەکـــان

پـــۆست و مـــوقام نـــابێ بـەشەر گـەورەکـا
هـــیممەتی ئـــینسانە، جـــێگا بـــەرز دەکـــا

خـــیلقەتی ئـــینسانی ئـــەگـــەر چـــێ لەگـــڵ
هـــیممەتە دەیـــباتە ســـەر ئـــەفلاکـــی کـــول

بـــێتو نـــەبی غـــەررە بـــە دادەی خـــودا
ڕۆژە دەگـــــــەڵ ڕۆژە چـــــرا نـــــوور دەدا

وەخـــتێکی پـــێت کـــەوتە دەنـــێو غـــەررەیی
پـــــێوەدەدا مـــــاری تـــەبیعەت بـــەوی



مـــــتبەقەکـــە، مـــاڵە کـــەسێکی نـــەما
ـــۆنی غـــەزای کـــووچە بـــە کـــووچە بـــا

ئێستێ لەماڵ رۆنی نەباتی هەیە — وەختە کە دەرمان گەنەشم[٤٢٥] گیر نەیە

شۆرباوە چەن خۆش بوو لەنێو مەترەتی[٤٢٦] — سفرە لە چەرمی[٤٢٧] بوو سەفات لێدەدی

یابوو، مەجوومعە و کەشفی زەرد و جوان — چایی لەسەر، قەندی لەسەر، دیوەخان

قەیسی و سێو، هەرمێ و گێلاس و بێ — داری بەلاڵووک هەڵووچە و ترێ

غەیری دوو سێ میوە، لە شار کوا هەبوو — هاوین و هاوینیش ئەوانە دەبوو

ئەسپۆنە جێی قابی لە شیوی لیباس — جوانی دەشوت پێچ و کلاو و کراس

بانە گەڵەسەر بوو بۆ شوتنی سەران — مووی وەکوو ئاوریشمی دەکرد بۆ ژنان

دیزە و گۆزە، کێ دروستی دەکا — تەندوورە ماڵی چ کەسێ نێوی ما

مەنجەڵ و قاپ، دەوری و کەوچکانی دار — جەمعی بەسواغی دەشۆرا نێو حەسار

نێوی بەرهەڵبێنە نەما لای ژنان — چەرخی زەمان بۆچی ئەوانە نەمان

گیزەی سەماوەر بە ڕەژی چەندە خۆش — لەززەتی چای، خەڵکی دەهێنانە جۆش

ئاوڵەمە، دوودکێشە، سەماوەر ئەلان — کوا، بێ ڕەژی قوڵتەدەدا وەک چەلان

کوا، پنە و وەردێنە کە گیانی برا — ئەستێوڵک نێوی لە قامووس نەما

یا تەبەکی ئاردی لە ماڵ کوا هەیە — نان کرین ئەورۆکە بەلای گەورەیە

داخوا قەلانگ و کوڵەوەژ دێنە گیر — سەتڵ و گوریس کەوتۆتە چالاو و بیر

بەتەبی سەر تەندوورە وون بوو نەما — مەنجەڵە ئاو، دیزە کە قوڵتێ بدا

خەرەبی دەستاری و نارەی ژنان — کوتکە دەگەڵ بەردانی گۆشتی بڕان

کوانێ ڕەژیدانە لەبن سەرسەرا — سەلکە ڕەژی و خاکە ڕەژی لێ ببا

دیزە و دەرخۆنە و مەنجەڵ لەکوێن — تاقە و رفحان و شتانی دەکۆن

سەتڵ و گوریسیشم نەماوە لەماڵ — لولەکەشی کردی قەبالەی بەتاڵ

مەنجەڵی مس کێیە سپی کاتەوە — وەختێ کە ئاساری نەما، ماڵەوە

شەقە مشارانی نەجاری لەشار — بۆتەوە بێکارە بەدەستی نەجار

کوا هەیە بریانی کەبیخۆم بەیان — لەززەتی پاروی وی پەنیری مەڕان

بانە دەتەندوورە بپێشێ کەدوو — لەززەتی پاروێکی هەزاری بەدوو

تاعیون و هەڵوای گێزەرێشم نەما — هەڵوای دۆبێمانم لەشاری برا

کــوانـــێ لە فـــایتوونی خـــەبەر لاوەکـــان — خـــەڵکی بـــەسواری وی بـــچن مـــاڵەکـــان
چـــەندە بـــڵیند بـــوو لە بـــۆ دووچـــەرخـــە سوار — هەوڕازی شێر، خـورتـیـیدە[٤٢٨]کـەی سـەربەخوار
یـــادێ لە هـــەوڕازی گـــڕاوانـــی شـــۆر — چـــەرخـــە وەســـەر وی نـــەدەکـــەوتن بـــەزۆر





ئاموزلی بەریزم کاک صدیقی انجیری آذر، نووسەری چیروکی دایکی نیشتمان دە سالی ۲۴دا کە خوشی تیبدا بەشدار بوو.توضیحات ۲۰۲

## ﴿ شتەقەدیمەکانی سابلاغ «٣» ﴾

داشامەجید هەورە دەگرمێتەوە    شوانە لە ترسانی دەلەرزێتەوە[٤٢٩]
نیوەشەوێ شۆقی بروسکەی سەران    ڕوونی دەکا دەشتێ دەگەڵ بەندەنان
ڕێژنەبی بارانی بە گڕ دێتە خوار    شەتڵی دەکا شوان و مەڕ و بزن و کار
کارگی کەمایە دەکوڵێ بۆ دەرێ    تاکوو لەبن عەرزی بچێت بۆ دەرێ
بەو شەوە کوێستانە لە بۆنی گوڵان    بۆتە بە مەیدانی گوڵ و عەترەکان
هەورە ڕەشە دوایە دەچێ سەر، سەرێ    مانگ دەگەڵ ئەستێرە دەکەونە دەرێ
هەوری ژیان گەرچی تەمی داوەپێو    وەختێکی دەیبینن، دەچێ ئەو لەنێو
ژینە زەمانێکی کە دەردێ بدا    شادی بە دوایدا دێ بیدوونی بەلا
گەرچی لەلات لاچوو گوڵی ژینی جوان    تۆڵە دەهێنێ تەبیعەت لەوان
مەسئەلەبی ژینە قیاسێک لەوی    عیبرەتە بۆمەش کەنەبین سەر نەوی
شوانە بە خۆشحاڵی دەدا ئاورێ    بنکەیی گوێنیانی لە باری کەرێ
شیری مەڕە کوێرێ بەجامناسەوە    دەکوڵی دەجۆشێنن لەبۆ خوارنەوە
شوانە کەترسی لە برووسکەی نەما    گەرم و گوڕە خەو بەسەریدا سەپا
نیوە شەوێ خەونی دەبینێ کە شا    بۆتەوە نێو جەمعی مەڕ و بزنەدا
چونکی کەنەیدیبوو جێگای خۆشی وا    دەیکوتا هەرنێری هەرای کردبا
توونی و برسێتی کەوت نێو مەڕان    کارە و بالەی مەڕ و بزنی... ئەمان
چەرخی فەلەک حاڵی، چ هاتۆتە سەر    هەورە گەڕاوە کە بەلا با لەسەر
شوانە کە سەرمەستە لە شیری مەڕێ    فیکری کەسێ ناکا لە خوار و سەرێ
ئەهمیەتێ نادا بە وەزعی مەڕان    بێخەبەرە مەڕ نەبێ نابێتە شوان
تاکوو لە خەو بێتە خەبەر نێو گەلان    قودرەتی لادەبرێ بە چەرخی زەمان
ژینە میسالی ئەوەیە گیانەکەم    غەررە مەبە شای تۆ لە نێو ماڵەکەم
گۆڕەوی بەن سادە و لاسک شکاک    چەندە دەڕازاوە بە پێڵاوی چاک

کالۆشی لاستیکی بەزستانی سارد
نانی مجێورانم دەگەڵ نانی شوان
هیچ ئەسەرێک دیارنێ لە میل و کڵاو
توتن و پەڕ[٤٣٠]، پووشوو و ئەستێ و بەرد
سبگاری قامیشی دەگەڵ توتن و پەڕ
وەختێ خەنە[٤٣١] و ڕەنگە ئەما نێو ژنان
گێل‌گێلە و دەسرەی هەوری دەجوان
کوا لە گوزەر سازی دەکا تاس‌کڵاو
کورسی و دارانی بەڕو و مەنقەڵی
دەنگی چرا بەرقی، شەقەی گۆزەکان
یادی کەرێزانی لەنێو پشت‌قەلاّ
کێ‌یە بۆ نێو شاری بەباری کەرێ
کاک عەلی جۆخۆشە کەسادە دوکان
مەولودی، قوربانی بڕێک ما، لەشار
کوانێ بە بەزمان و بە شۆخ دێتەخوار
داخوا لەنێو چۆمە هەبە هەر سەگاو
یا بەرە هەر ماوە لەنێو ماڵەکان
کوانێ دەکا خوشکە لە بەستێنێ باد
خەڵکی لەشاری گوزەرانیان چبوو؟
کوا خەبەرێک، هێلکەی ڕەنگ لێدراو؟
هێلکە شکێنەش ئەسەری لێ‌نەما
کوانێ لە پەیوەندی گولاّن باغی سێو
تەپیەیی تابانی جێگای مەسنەکان
گومرگ و تەسبینە هەبوو لای‌گڕاو
بەرمووری مووریان و دەخڕخالی پێ

گۆرەوی بەن نێوی دەکالۆش لباد
شۆرباوی فەقێیان لە شاری بڕان
تاکوو بە ئاوریشمێ برازێ تەواو
جێی وی دەگرت شەمچەو چەخماغی بەرد
کەم بووە ئەورۆکە لەوانە ئەسەر
قەدری گەڵاگوێزی لە باغی نەمان
کوانێ دەبەستن ژنی ئێستێ لەوان
ئەحمەد[٤٣٢]، حەکیمە شەلەشم بوو تەواو
ژێری لێفەی گەرم و خەوی خوڕخوڕی
یادی نەما نێوی مەهابادی جوان
هەر سەری کووچێکی کەرێزێک هەبا
بارانی گیا[٤٣٣] و وێنجە بهێنێ و بەرێ
ماشێنە جۆی ناوێ وەکوو یەک سمان
ئەمما ئەویش نێ وەکوو ساڵانی پار
نێو گەڕەکێ پیاو و کوڕی شۆڕەسوار
بانە مراویانی چکۆڵەی بناو
وەختێ لە دێهاتی لبادیش نەمان
شیو وکوڵی مێشە و دارانی زیاد
ئایا وەکوو مە، غەم و دەردیان هەبوو؟
دەستی منالاّن، خەبەری بێنە ناو؟
هێلکە بە دەتمەن کێ دەکا کاری‌وا
وەختێ نەما هیچ گوڵ و قاناوی مێو
دەورۆ بەری پڕبووە خانووی کەسان
بەردی لەسەر بەردی نەماوە لەناو
خەلخلی بازنانی کچانم لەگوێ

پاوانەکەی جوانە ژنانی قەدیم
کوانێ دەگەڵ فیکرانی ئەورۆ نەدیم

یادێ لە تیغ‌بەندی[٤٣٤] دەگەڵ گوللەبەند
کێ‌یە قەبووڵی بێ، شتی‌وا پەسەند

کوا قەڕەچی و دومە لە پشتی تەکێ
دەنگ و سەدا نایە لەبن دارە تووێ

دارە تووە ئەسل و ئەساسی نەما
عەرزە دەگەڵ دارە تووە لابڕا

یادی مناڵی و هەتەرێ و مەتەرێ[٤٣٥]
کاکی من ئەشێنکی بهاوێ دەرێ

یانە دەیانکوت کە «هەلاوە و مەلاو»
«ڕەببی بە زاوا بێ عەزیز تازەلاو»

دانوولەی منداڵی ددان هاتووان
ماوە لەنێو خەڵکی لەنێو خانووان

## ئافتاوە لەگەن[٤٣٦]

میوانی‌یی شا و فەقیر و گەدا
جەمعی زەمانانی قەدیم باسەفا

ئافتاوە دوای نانی دەهات گەڵ لەگەن
ئاوی گەرم، سابوون و خاولی پەسەن

پێش‌خواردنی نانی، ئەوە هەردەهات
تاکوو کەسێک دەستی دەشوا، با بشوات

نێو شارە دوو جوورە لە وانە هەبوو
یامس و یا زەردی بڕینجی هەبوو

ئەورۆکە ئاساری عەنیقەن لەشار
کەم ماڵە ماوێتی شتی‌وا بەجار

چوونکی زەمانیکی بەخزمەت گران
ئەورۆکە، ئاغان و عەنیقە و گران

لەززەتی خزمەت ئەوەیە گیانی من
نەک کە بە قودرەت بی، بکەی سربڕین

غونچە لەخۆڵی زەوی پەیدا دەبێ
کوانێ لەبەردی، شتی وا دەر دەبێ

بەردە دەبێ بشکێ ببێتن بەخۆڵ
زاڵمی سەر چەرخی نەمێنێ بە پۆڵ

## خواجانەکانی پێش دەرکان[٤٣٧]

مۆد بوو لەپێش دەرکی گەلێک ماڵەکان
لێی بێ دوو خواجانە لەپێش دەرکەکان

جێیەکی زۆر چابوو لەبۆ بار بەران
باری لەسەردانێن بڕێک دەن ووچان

خۆی ئەوە جێگایی قوماری مناڵ
دەورۆ بەری پڕبوو هەموو وەختی ساڵ

هەرکەسە زوو چووبا، دەبوو ماڵەوی
خۆش بوو هەڕا و گڕمە، قوماری سەری

یا دەبوو خواجانە جێگای میرمیرێن
یا قەلە مندارە قەرێ هەی قەرێن

بـــووک بـــووکێنی جـــوانـــە کـــچانیش لەســـەر    وەخـــــتێ نـــــەبوو کـــــووچە کـــــوڕانـــم لەدەر
خـــــــواجـــــانە ئـــــاساری نـــــەماوە لەشـــــار    تـــــەختی قـــــومارانـــــی مـــــناڵ هـــــاتەخوار
خـــۆشە لەپـــێش وەیـــدا لەســـواری کـــەوین    غـــــەررە نـــــەبین زۆر دەســـــەڵاتە، و قـــــەوین
چـــەرخـــە هـــەزار قـــودرەتی ئـــاوای شکـــاند    زۆر کـــــــەلەبابی نـــــەبەزی وای بـــــەزانـــــد



مەنزەرەیەک لە فقرەقا سالی ٣٨، ئەوە ئاساریکی دەورەی مادانە.

## سەنعەت کارەکانی سابلاغ[438]

داشامەجید عومرە بە ئاخری گەیی    ئەو دڵی بێعارە ئەوینی قەوی

فیکرە لەسەر چاکە نەبوو وەختی ژین    دوو قەدەمێک دانێم بە دەستووری دین

هەر دەفیکر ماڵ و ژیان منال    عومرە بە ئاخر چوو، قەباڵەش بەتاڵ

ئاخری ژین هاتۆ، هەساوم لەخەو    فایدەبی کوا هەیە تاریکە شەو

هەر وەکوو پەروانە بەدەوری گولان    فیکری نەبوو گیانە، لە رۆژێنی زەمان

چەرخە ئەگەرچی بە مووررادم نەبوو    قەدد نەبوو تەسلیمی ئەوی‌بم بەزوو

دونیا تەلەسمێکە بەشەر کەوتە نێو    چەند خۆشە گەر دوور بێ لەکاری دزێو

ئاساری چاک باشە بمێنێ لە دوا    چونکی بەقای بۆنێ، سەری تەختی‌شا

زیندەگی وا هاتوو، و چووە کاکەگیان    بۆچی دەکەن خەڵکی سەرێ، سەرکوتان

بەندەیە، رۆژێکی بڵێندە و نەوی    حەیفە بگۆرێ، کەبڵێند بوو و قەوی

زۆر گوڵە نێو باغی بەپۆز و بەبۆن    بولبولە دەوری بوو وەکوو ئی دەخۆن

بۆنی دەدا، جوان بوو بە رووی باغەکە    تەعزیمی زۆر بۆ وی دەکرت خەڵکەکە

ئەمماکەزۆر پوز و ئیفادەی نواند    دەستی تەبیعەت لێ وپۆپی شکاند

ئەوگوڵە ئەمسیلە لە ژینی ئەوا    پێنج و دوو ساڵێک دەبێ ئاکاری وا

وەختێکی چەرخە دەگەڵی هاتە شەڕ    وای دەکوتێ خەڵکی نەبینن ئەسەر

شێنە شەماڵ دێتەوە سەر رووحی وی    تێکی دەدا قودرەتی بەفری قەوی

مونتەزیرم تا قەدەمی بێنە پێش    لاچێ لەدڵ دەرد وغەم و ژان و ئێش

دەستی تەبیعەت چ قەوی بۆ کوتان    کوتکە دەبوکتە کوولەکە و پێوەدان



ئەووەڵین میکانیکی[439] ئەو شارەمان    قادری نێو بوو لەبەشی تۆکمەچیان

میرزا موحەمەد[٤٤٠]کە سەری حاڵ و پیر — نابێ کە هیچ وەختێ بچێتن لە بیر
میرزا موتەللیب[٤٤١] و برایانی وی — کارانی جوانم لە ئەوانیش دەدی
نووری سەعات سازە[٤٤٢] هەبوو نێوی شار — چی نەدەزانی لە سەعات و لە کار
یادێ لە وەلیانی[٤٤٣] سەعات سازی خۆن — کاکە کەمالیانیش لەوانی دەکۆن



عەککاسی تاهیرپوور[٤٤٤]، ئیدی داوده جوو[٤٤٥] — هەورازی دوخانێ دوکانی هەبوو



وەختێکی دووچەرخە لەشار هاتە روو — مینە[٤٤٦]ئەوەڵ، دوا، کەریم[٤٤٧] ئوستادی بوو



قوڵەی سەماور بە ڕەژی شۆقی نێ — وەختێ وەستا ساڵە[٤٤٨] لە مەیدانێ نێ



سەتڵی وەستا خانە[٤٤٩]،حەسەن خاوەری[٤٥٠] — ئاوی لە چاڵاو و کەریزەی بڕی



جاجموبەرماڵلەبێشیران[٤٥١] — بووجوانعەبلاێخەمیری[٤٥٢]بووحەمەی[٤٥٣]خزمیبان



مام فەرەجم کەنکەنەچی شاری بوو — پیر و نەخۆش پیاوێکی زۆر ڕازی بوو

## خەییاتەکانی سابلاغ[٤٥٤]

کاکاغا[٤٥٥]، سووڵتانی[٤٥٦] ئەوەککول[٤٥٧]کە بوو
شالواری جوان کۆتی چجوانیان دروو

یادێ لە عەلیالی[٤٥٨] وکاکە عەلی[٤٥٩]
خەییاتی کوردی وەکوو وانم نەدی

ماڵە مینە ئاغا[٤٦٠] بوو لە نێوی گوزەر
کاکە شەریف[٤٦١] بوو کە نەما لێی ئەسەر

چاکەتی پڕ لۆکە نەماوە لە شار
سەرمایی زستانێش نەوەک ساڵی پار

## سەرراجەکانی سابلاغ

ڕاستەیی سەرراجان کە عەبلاً[٤٦٢]دەبوو
وەستا جەلیل[٤٦٣]، وەستا سمایل[٤٦٤] هەبوو

ماڵە حەمەی سارێ هەموو، کاری جوان
نەقش و نیگاری هەموو زینێک لەوان

یادی لە نەقشانی غەنی[٤٦٥] زیندروو
کاروانسەرای سەید عەلی دوکانی بوو

مەلوودە[٤٦٦] کالانی شەمامەی دەبەست
حەیفە کە کارجوانی ئەوا چوو لە دەست

کاکە حەسەن[٤٦٧]، مامی سمایل کە بوو
نەقش و نیگارێکی چ جوانیان هەبوو

## کەوش درووکانی سابلاغ[٤٦٨]

یادێ لە کەففاش و جێگای وی لە شار
دەور و بەری پووتی حەمامی بەکار

قوندرە بوو کەوش و گێلاسی گران
یادی ئەبولخالەقی[٤٦٩] ئوستادی وان

یادێ لە عەمبەرسم ئیدی مانیگۆن[٤٧٠]
ئەرمەناک[٤٧١] شاگردی و سمایلی[٤٧٢] دەخۆن

ئەحمەدە شەل[٤٧٣] بوو ئەسەری لێ نەما
ئاخری عومری بە زەلیلی ژیا

ڕەحمان کالو[٤٧٤] و کەوشانی چاکی لەکوێ
کەوتۆتەوە.نێوی لە نێو شاری نێ

عەبلا دوو دوو[٤٧٥]، دەستکر و دەستکاری جوان
کەوشی گیلاسی وی نەماوە ئەلان
کالۆشی جوانی ئەوی مەشهووری شار
سازی دەکردن لەتیووبی بەجار

## کەوش فرۆشەکانی سابلاغ

عەبلای ئالتوونی[٤٧٦] دەگەڵ بانەیان
قاسم[٤٧٧]،نەقشبەندی[٤٧٨]،دەگەڵ سەیدەکان[٤٧٩]
حاج ئەحمەدی[٤٨٠] پیرم لەدەرکی گوزەر
کاکە فەیزوللاشم[٤٨١] نەماوە ئەسەر

## ئاسینگەرەکانی سابلاغ

گاسن و پاچ و پێمەڕە و تەورە داس
پشک و تەلە، گولمیخ و لاولاو و داس
هەرڕبی دەمێنە کوڕە»شت ساز دەبوو
حاجی عەبە[٤٨٢]، حاجی سمایل[٤٨٣]کەبوو
یادێ لە بێوکئاغا[٤٨٤]، چحیک گەڵ ئەوی
هەردوو بە ئاسینگەری چوون بن گڵی
وەستا سلەمان[٤٨٥]، عەلی‌ئاغا[٤٨٦]، نەمان
وەستا سەعیدی حەمەلاوی[٤٨٧] لەوان

## نمەدمالەکانی سابلاغ[٤٨٨]

مسگەری قاپانی مسم هاتە یاد
نێوی نەمەدماڵی نەماوە لە یاد
لای سەییدی نەجمە[٤٨٩] کە کارم دەکرد
ڕۆژێ پەنادێکم لە وی وەردەگرت
کاری نمەد سوونەوە نێوی حەمام
سەخت و گران نیوە شەوان بوو تەمام
یادێ لە ئوستادی بەڕێز کۆکەیی
هەی بوو دوکانێکی درێژ و نەوی
کاک خدری زەرگانیش[٤٩٠] وەیادوو کەوێ
ئەحمەدی نێرێ[٤٩١] و پەسەندی[٤٩٢]لەوێ

## مسگەرەکانی سابلاغ[٤٩٣]

حاجی عەلێ ئەکبەر[٤٩٤] و جەمعی کوڕان
مسگەری قابیلی دێ و شارمان

وەستا نووروڵلایە[٤٩٥] بوو بابی شەفەق
ئەورۆ لە مس نایە لە هیچ لایە تەق

مۆدی نەماوە لە زەمان مەنجەڵم
کێیە سپی کاتەوە تا بیکڕم

فافۆنە جێی گرتەوە لێی مەگرە عار
قەل لە جێگای قازی دەکا قاڕەقاڕ

## دەباغەکانی سابلاغ

کێیە کە سازی کا لەوێ قایشی جوان
حاجی ڕەشید[٤٩٦] و قەرەنی[٤٩٧] چوون نەمان

کاکە موحەمەد[٤٩٨] بوو دەگەڵ حاج عەلی[٤٩٩]
داخە... کە هەر چوارەکە چوون بن گڵی

ئاغابەگە شەل[٥٠٠] بوو کە کەوڵ و خوری
ڕیخۆڵە و پێستی لە شاری کڕی

پێنەچێکان بەزمی فەدیمیان نەما
هەرچی هەبوو خۆشی، وەناڵە گەڕا

کاکە حەمەدخانی[٥٠١] بەڕێز پینەچی
پانێ و پەنجانی کەوش بەزمی وی

کاک حەمەدی پوورسلەمانێش[٥٠٢] نەما
دونیا هەتا سەر بۆکێی کردۆ وەفا

نێعمەتە[٥٠٣] وەستایەکی چاکی کەوش
دەسکری زۆر چابوو بەڕێ وڕەوش

کەوشانی لاستیکی نەماون لەجێ
کێیە کەفیکرێکی لە وانیش بێ

مەحموودی گادانی[٥٠٤]، ڕەسووڵ نایە
ساڵ و ئایامانە لە ژین غایبە

## شیرنی پەزەکانی سابلاغ[٥٠٥]

بێینەوە سەر شیرنی پەزی شارەکە    عابید[٥٠٦] و وەستا عەلی‌ی شیرەکە[٥٠٧]
وەستا حوسێن[٥٠٨] شۆرەتی قەنداخچی بوو    شیرنی لە شیرنی ئەوی خۆشتر نەبوو
شەکر و گوێز و ماجووم و باقلاوە، خۆش    وەستاعەلی سازی دەکرد بۆ فرۆش
شەکر و ڕۆن و ناسکە کوللێر هەڵ گرا    هیچی لەوان خۆش نی‌یە عابید نەما
میرزا برایمی عابیدی پیاوی چاک    مشتەری زۆر زۆر بوو کوللێرانی پاک
شانسانی وەستا عەلی دانەی پەناد    پووڵی دەنێو دابوو ئەوەم هەر لە یاد
ئای لەبەر سەید قادری قەنداخچی‌یە[٥٠٩]    قەندی ئەوی میحلی لە شاری نی‌یە
ئەووەڵین قەند ڕێژ بوو لە شاری ئەوە    کوا خەبەرێک ئەورۆ لە شیرنی ئەوە
کاک عەلی جۆرابچی[٥١٠] لە قەندرێژی شار    خۆی و دوکانی هەموو لاچوو کەنار
ناسکە کوللێرانی بە دوو قرانی کوا    حاجی محێدینی[٥١١] قەدیم سازی کا

## دوکاندارەکانی سابلاغ

داشا مەجید ڕۆژە کە دێنە دەرێ    تاریکی سەر شاری دەچێتە دەرێ
شۆقی هەتاوێ هەموو جێ ڕوون دەکا    تینی لە پووڵدار و فەقیر بەش دەکا
نەم نەمی بارانێ بە جوانی دوڕە    عەرزی دڕوو دێنێ ئیدی سونبولە[٥١٢]
داشا مەجید ئاڵۆزە فیکرم بەتۆ    هەر دەمە ڕەنگێکە لیباسانی تۆ
نێو شاری قوڕثانی بڵیندگۆیەکان    دێتەوە گوێی خەڵکی لە مزگەوتەکان
چاوێ لە ئێعلانێ دەکەم مردووە    ئەو کەسە زۆر دەوڵەت و ماڵی بووە
گەرچی نەبوو پیاوێکی زۆر چاکی شار    ئەمما سەردخۆشی هەرایە بەجار!

وەختێکی دەی‌نێژن هەزارانی لێ — ماشین و تاکسی و مینی بوومی پێ
ئەمما دەسووتێنێ هەناوم شەوێ — یەکی فەقیر دەمرێ کەسێ نیێ لەوێ
یەک دوو نەفەر تابووتی سەر شانی‌یە — مام و برایە و لە کەسانی دی‌یە
کەس نیێ لە مزگەوتی فەقیری ئەوا — تەسکینی خزمان و کەسانی بدا
فاتیحەخانی و سەرەخۆشی کەمە — داخی گرانم... کە فەقیری تەمە
کەنگێ تەبیعەت دەبێ تەنیێ لە کار — خەڵکی بکا فیکری هەموو خەڵکی شار
مەخلووقی مەولایە لە قوڕ ساز بووە — ئاخر مەکانیشی لە ژێر وی بووە
دەروێش و بێچارە و پووڵزۆر و کەم — دوو گەزێ جاوی دەگەڵە چاوەکەم
دەنگی بلێندگۆش لە دڵ ئاگا دەکا — مردووە پووڵدار و بێ‌پووڵە یا
یەعنی ئەگەر دەنگی قەوی بێ لە گوێ — مردووە پووڵدارە یەقینت هەبێ
وەختێکی دەنگی کەمە بۆ نێوی شار — تەجرەبەکەم وایە فەقیرە و هەژار
ئاخری ئەگەر بێ‌ئەدەبیشم دەبێ — ئیخلاس و ئیمانم لە دڵ کەم دەبێ
چاکە بکەین، چاکە دەمێنێ لەدوا — تاکوو نەهاتۆ لەدوو بانگ و سەلا

## قەسسابەکانی سابلاغ

عوسمانی قەسسابی دەگەڵ مام وسوو — گۆشتی مەڕ و بزن و بە راسیان هەبوو
گۆشتی مەڕی کاکە عەلیکەی مەلای — مەحموودی قەسساب و غوڵام[513] و برای[514]
گۆشتی ڕەشە وولاغی ڕەحیمە شریت — کاکەکە، بەنگینت لەبیری نەچیت
گۆشتی مەڕ وگیسک و بەڕخ سێ‌تمەنی — داخی گرانم چۆتە نۆسەد تمەنی
چرج و لەڕە بەرخە بە فوولاپەوە — گیسکە خرابتر، نێوی یەخچاڵەوە
شەرمێ دەکا پیاوەکە دەیخوا لە ماڵ — شۆرباوی ئێسکانی نەهاری عەباڵ

## بەققاڵەکانی سابلاغ

حاجی حەسەن پیرە پەنیری نەما | وەختێکی ئاساری دوکانی نەما
کێیە فەرامۆشی بکا، تا هەیە | پێبنە پەنیر، لای حەمەدی پیرەیە
بانە لە شیریژی عەلی دوژمنی | فەعلە و بێچارە هەموو دەیکڕی
ڕۆنی حەمەلاوی سپی و پاک و جوان | کوانێ سمایل[٥١٥] دەگرێ جێی ئەوان
چووکەڵ و غەوواره[٥١٦] لە ڕیزی بەقاڵ | داخە لەدڵ ژینی ئەوان بوو بەتاڵ
کاکە مەجید، کاکە ئەحەدە شەلە | جووجکە بەقاڵێک بوون شۆخ و بچکەلە
حاجی سوولتانە کەچەڵ و کاک جەلیل[٥١٧] | ئاسوودە نوستوون و ئەمەش وەک زەلیل
سەیدە حەسەن، کابانە دەنگ خۆشی شار | سەیدە محێدینە کوڕی زۆر بەکار
مەیدانی مەنگوور، کە جێگای گەورە بوو | پڕبوو لە ڕێواس و کوڕادە و کەلوو
شاکاشی[٥١٨] پڕماستی مەڕان و تۆراغ | هەرکەسە ئیچاکی دەگرتن سۆراغ
یەک سێ بە دووقڕانی بوو ماستی مەڕان | ئەورۆ لەمن بۆتەوە نۆسەد قڕان
کێفۆک و پۆڵکانی[٥١٩] کۆلاوی دەوێ | نەفسە کە سەیدووکەی نەبینێ لەوێ

## قاوەچێکانی سابلاغ

حاجی ڕەشە،[٥٢٠] حاجی غەنی،[٥٢١] دەم‌بەدەم | چای بە پەنادێکی دەدا تازەدەم
یادێ لە کاک ئەحمەدی[٥٢٢] پیاوی سەلیم | خۆی و گرامبی و گۆڕانی قەدیم
کاک ئەسەدە کوێرە نەماوە لەوێ | کافەیی کاک ئەحمەدی بەزمی هەبێ
چێبۆدارە کانیشم جێگایان بڵاو | قەننەکێشان و گرەمافوون نەماو
سۆفی حەسەن[٥٢٣]، قادر[٥٢٤] و دەرویش کەریم[٥٢٥] | مەیدانی مەنگوور بە دوو چای وان غەنیم

کاکە عەلاو[٥٢٦] غەرقێ لە ڕەحمەت بێ
قاوەچی ئاوا دەبێ مەشهوور بێ
ڕەحمەتوڵڵا[٥٢٧] قاوەچی‌یی خۆش زبان
چووک و قوڵە پیاوی حەلیم دەجوان
کاکەکەریم سێبستە،[٥٢٨] دەگەڵ قادرە سێڵ[٥٢٩]
کاکە کەریم جووجوو[٥٣٠]، عیمادی[٥٣١] جحێڵ
عەبلا شەدە ڕەش[٥٣٢] بوو لە مەیدانی ئارد
چابخانەکەی دوابە بۆ کاراژی نارد

## بەززازەکانی سابلاغ

ڕەحمانی عەتاری و حاجی کەریم[٥٣٣]
مەزن[٥٣٤] و وەلیکان[٥٣٥] و جەجۆ[٥٣٦] بوو کەدیم
حاجی چەڵەبی[٥٣٧] بوو دەگەڵ سەیدەکان[٥٣٨]
حاجی حەسەن[٥٣٩]، دانیاله جوو دوور لەوان

## عەتتارەکانی سابلاغ

حاجی مینەی زاهیدی حاجی ڕەحیم[٥٤٠]
ماڵە تەدەیونی و ڕەبانی قەدیم
سعدوونی مشکان[٥٤١] بوو و ئەسکەندەری[٥٤٢]
قادر[٥٤٣] و وەیسی[٥٤٤] بوو لە مەیدان سەری

## ڕەژی فرۆشەکان

کوانێ سمایلی فەرەجی[٥٤٥] بۆ ڕەژی
سەڵکە ڕەژیم داتێ بۆ سەرماکوژی
کاکە حەبیب گسۆجە[٥٤٦] لەمێژە نەما
کاکە کەرە[٥٤٧] ماوە لە دووی هەڵوەدا

## دارکێشەکانی سابلاغ

دارکـــــێش و بـــــەردکێشەبوو، قـــالەڕەزا
حـــــەیفەکـــە ســـولتانە درێـــژیش نـــەما
بـــادێ لە قـــازیلە[٥٤٨]، ســـولێمان کـــوڕی
کـاکـە لەتـیف، مـاشەرەفی[٥٤٩] کـا عـەلی[٥٥٠]

## نالبەندەکانی سابلاغ[٥٥١]

تـــەق‌تەقی نـــالبەندی هـــەرای ئـەسبەکـان
نـــایە لە مـــەیدانـــی ئـــێسای مـــەنگوڕان
وەســتا کـەریم[٥٥٢] وەســتا ڕەسوولم[٥٥٣] نەبێ
ئـەسبە لەواشـمە[٥٥٤] نـەبێ چـۆن نـاڵ دەبـێ
وەســتا حـوسێنیش[٥٥٥] بـوو حەمەی نێوگولاو
قـادری قـەرەنی[٥٥٦] سـەری بـەرداشـی پـیاو

## سابوون سازەکانی سابلاغ[٥٥٧]

سـابوونی کـاکـاغا[٥٥٨]، ڕیشـۆڵ خـواکـەرەم[٥٥٩]
کـاک حـاجی عـەبلاش[٥٦٠] بـوو لەیـادی نـەبەم
حـــــەیفە نـــەماون کـــە بـــبین لەشـــار
ســـابوونە چـــۆن قـــیمەتی بـــۆتە هـــەزار

## خمگەرەکانی سابلاغ[٥٦١]

خـمگەری شـاری بـوو سـەباغ[٥٦٢] وکـەریم[٥٦٣]
وەسـتا بـرایـم[٥٦٤] بـوو سـمایل[٥٦٥] قـەدیم
حـاجی سـۆفی سـالە[٥٦٦]کـە، یـادی بـەخێر
مـوددەیەکـی زۆر نـیێ دەبـن خـاکـە ژێـر

## لێفە درووکانی سابلاغ

ئـیبراهیمی خـۆزێ[٥٦٧] دەگـەڵ کـاکـەمەم[٥٦٨] قـادرەلاڵ،[٥٦٩] سـاڵەکـەری[٥٧٠] بـیر دەکـەم

## کۆتر بازەکانی سابلاغ

کـۆترانـی جـوانـی بـوو بـداغـم[٥٧١] لەشـار ئـەکـبەرە بـێغەم[٥٧٢] بـوو لەدوای هـاتەکـار
مـوستەفای بـابانزادە کـۆترانـی جـوان هـەی بـوو لەنـێو شـاری لەڕێـزی ئـەوان
کـاکـە عـەلی شـێنکی[٥٧٣] و یـونس[٥٧٤] لەشـار حـاجیلوو، کـۆترانـی نـەماوە بـەکـار

## کورتان درووکانی سابلاغ

وەستا کەریم،[٥٧٥] ڕەحمەتوڵڵا،[٥٧٦] کاک تـەها[٥٧٧] کـورتانی زۆر جـوانـیان بـە دەسـتی کـرا
یـادی مـوحەمەد خـڕە[٥٧٨]، سـەر حـاڵ و خـۆش مـوستەفا[٥٧٩] لای وەسـتا کـەریم زۆر بـە جـۆش

## مریشک فرۆشەکانی سابلاغ[٥٨٠]

کـاکـە مـوحەمەد کـەچەڵ[٥٨١] و جـووجکەکـان بـارۆکـە و قـاز و مـراوێـانی جـوان
بـەزمی دەمـەیدانـی هـەموو سـەر ئـەوی پـیاوێکی زیـرەک بـوو بـە فـیکری ئـەوی

## چەرچێکانی سابلاغ

یـــادێ لە مـــەحموودە قـــوڵە و جـــووجکەکـــان
بـــەزمی هـــەبوو رۆژی لەبـــن ئـــاشی جـــوان

هـــەرچـــی کـــە هـــاتبایە لە جـــووجکە و قـــەڵێ
چـــەرچـــێکی زیـــرەک بـــوو دەبـــوو بـــیکڕێ

کـــاک شـــەریف سابلاغی، حـــەسەن سووری مەست
کـــاک عـــەلی هەنجیرەلەچەرچـــیانی سەخت

## حەمباڵەکانی سابلاغ

کـــێ یەکـــە حـــەمباڵی بـــەڵەد[٥٨٢] نـــێو بـــبا
تـــاکـــوو هـــەراکـــاتن بـــە ســـەد نـــاڵەوا

«ئـــای بـــینێری... مـــەولایەگیان... مـــەولایە[٥٨٣]
بگـــــرێ پـــــەناباد و قـــــڕان کـــــرایـــــە

حەیدەر[٥٨٤] و دەرویش[٥٨٥] و کەڵە پیاوی پیر[٥٨٦]
کـــارینەکـــەی خـــانووی قـــەدیم دێـــننەبیر

کـــوانـــێ حـــوسێن بـــووخچەیی نـــەکـــراوەیـــە
کـــاک کـــەڵە پـــیاو دەنگـــی لە نـــێومان نـــی‌یە

پـــــیاوێکی نـــــەققال و قســـــەخۆشی وا
بـــــۆ قســـــە و بـــــاری قـــــوڕس دانـــــەما

ئـــەمماکـــە زۆر پـــیر بـــوو دەســـی کـــردە سواڵ
کـــاکـــە کـــەلە پـــیاو بـــوو قـــەباڵەی بـــەتاڵ

## گاڕانی سابلاغ[٥٨٧]

کـــوانـــێ کـــەڵ و گـــامێش و گـــاڕانـــی شـــار
یـــانەمەڕ و بـــزن و بـــەرخ گـــیسک و کـــار

یـــــادی بـــــەخێر ســـــەر لە بـــــەیانانی زوو
جـــــەمعی دەڕۆیشـــــتن و گـــــاوان لە دوو

پـــــڕبوو خـــــەبابانە لەدەنگـــــی بـــــزن
دوای دەکـــەوت کـــیژ و کـــوڕی ســـەرقژن

تـــاکـــوو خـــڕی کـــانەوە وردەی تـــەنوور
ئـــارۆقەکـــەی ســـاڵێ بکـــا ئـــێستێ جـــوور

نـــایە ســـــەدای بـــزن و مـــەڕی کـــانەبی(٥٨٨) مـــــەولودی چـــالاو و عـــەلی کـــوێر(٥٨٩) نـــەبی
ســــاڵە و بـــابی(٥٩٠) بـــوو حـــوسێنە پـــەزە زۆر قـــــەڵس و تـــووڕە بـــڕێک بـــێمەزە





گومی پردی سوور کە دوای تیک چوونی گومی قازی وە رونەق کەوت.

